سامان قەرەچوغی

# گەنج
# لە نێوان گۆڕان و تێکشکاندا



هەولێر 2010

ناوی کتێب: گەنج لە نێوان گۆڕان و تێکشکاندا

بابەت: کۆمەڵێ وتاری ڕۆژنامەوانی

نووسەر: سامان قەرەچوغی

دیزانی بەرگ و ناوەڕۆك: هێرش مەغدید

چاپ: جەوهەر مستەفا

هەڵەچنی: مامۆستا محەمەد

سەرپەرشتیاری چاپ: هێڤا

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانەی منارە – هەولێر (٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧)

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧٤)

ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

لەسەر ئەرکی سەنتەری رۆشنبیری و هونەری قەرەچوغ چاپکراوە

## پێشەکی

نوسین وەك پرۆسەیەکی بەردەوام لە ژیانی مرۆڤ بەشێك بووە لە شارستانیەتەکەی و هەر نوسینیش لە شوێنی چاوی کامیرەکان لاپەڕەکانی مێژووی بۆ ئێمە تۆمار کردووە و لەگەڵ خوێندنەوەی هەر کتێبێکیش رۆژگارێك دێتەوە بەر دیدەمان ! هەر نوسینێکیش چ لە بواری مێژوویی ، زانستی ، فیکری ،رۆشنبیری ،کلتوری بێت ئەوا جگە لە بەڵگەنامەکان نوسەرەکان لە روانگەی فیکرو لێکدانەوەی خۆیانەوە چ خوێندنەوەیەکیان هەبێت بۆ مرۆڤایەتی لاپەڕەیەکیان بەنوسین نەخشاندووە !

ئەم نوسینەی ژێر دەستیشت بەشێکە لە راو سەرنجەکانی من دەربارەی دیاردەکانی رۆژگار ! هەرچەندە بەشێك لە نوسینەکانم زۆر کورتن بەڵام ئەوە مانای وا نییە کەمن مەبەستەکانم نە پێکا بێت ، بەڵکو ئەوەی مەبەستمە زۆر بە سادەو ساکاری گەیاندوومەتە خوێنەر ، چونکە لەم رۆژگارەدا جگە لەوەی ژمارەی خوێنەر بە پێی پێویست نییە لە هەمان کات خوێنەر حەزی بە خوێندەوەی بابەتی درێژ نییە بە تایبەتی لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا!

ئەم کتێبەی بەر دەستیشت بە شێکە لە کۆکراوەی ئەو نوسینانەی کە لە کات و ساتی جیاجیا لە رۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاوم کردوٚتەوە ! بە داخەوە پێشوتر بیرۆکەیەکی وەك ئەم پرۆژەیەی بە چاپ گەیاندنم لە

مێشك دا نەبوو ، بۆیە بیرم لەوە نەکردبۆوە کە تەواوی نوسینەکانم کە لە ڕۆژنامەکان بڵاودەکردەوە ئەرشیفی بکەم ، لەهەمان کاتدا جگە لەم کۆمەڵە وتارە بە دەیان ڕێپۆرتاژی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و هونەری وخزمەتگوزاری و چەندین دیداری سیاسی و فیکریم لەگەڵ ڕۆشنبیرانی کوردستان ئەنجامداوە لە هەمان کاتدا چەندین دیداری تایبەتیش لەگەڵ خۆمدا کراوە لە رادیۆو tv ڕۆژنامەکان لەسەر تەوەرەی جیاجیا بۆ خزمەتکردنی توێژی لاوان و ڕۆشنبیران و سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگاکەمان .

بۆیە هیوادارم ئەم نامیلکەیە ئەگەر بە کرچ و کاڵیش بێت بە خزمەتێکی بچوکی منی بزانن لە بواری ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری ! دڵنیامە بەبێ کەم و کوڕی نابێت ، چونکە وتەیەك هەیە دەڵێت (ئەگەر دەتەوێت کەس ڕەخنەت لێنەگرێ هیچ مەڵێ و هیچ مەکە !)

لەگەڵ ڕێزمدا

نووسەر
Saman_garachuxy@yahoo.com
٠٧٥٠٤٨٨٢٤٩٧

٢٠١٠/٣/٣١

# گەنج لە نێوان گۆڕان و تێکشکاندا

گومـان لـەوە دانیـە تەمـەنی (گـەنجێتی و لاوی) لـەرووی جەسـتەیی و فیکرییـەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ تەمەنی منداڵی و بەساڵاچوویی دا ! هـەر کـاتێکیش بـاس لـەم راستیە بکـەین ناچارین ووردبینانـەتر ئامـاژە بـەرۆڵی ئـەم توێـژە گرنگـە بـدەین و پەنجە بخەینە سەرکێشەو گرفتەکانی ، بۆ ئەوەی نەوەیەکی تەندروسـت و داهێنـەرو بەرپرس بنیادبنێین ، چـونکە تەمـەنی گـەنجێتی وەك قۆنـاغێکی هەسـتیار لـەژیانی مرۆڤدا کۆمەڵێ تایبەتمەندی هەیەو دەبێت رێز لـەم تایبەتمەندییـەبگیرێت و کـاربۆ خۆشگوزەرانی و گەشەکردنی بیرو بۆ چوونەکانی بکرێت ، بەداخـەوە سـەرەتای ئـەم گەشەکردنە زانـستیە لەهەنـدێ وولاتـدا دەبێتـە سـەرەتای تێکـشکاندنی جەسـتەیی و کەمکردنــەوەی رۆڵــی ئــەم توێــژە گرنگــە! ئــەویش بەبــەرێوەبردنی ململانێیــەکی ناتەندروسـت بـۆ کـپ کردنـەوەی تواناجەسـتەیی و فیکرییـەکان ، بەتایبـەتیش ئـەو ململانێیـە نامەنتقیـەی (منگـق) نـەوەکانی پـێش خۆیـان کـە بـەناوی لادان لـەداب و نەریت و ئایین ..هتـد دەبنـە بەربەسـتێکی گـەورە لەبـەردەم هێنانـەدی خەونـەکانی گەنجان، بەتایبەتی لەو کۆمەڵگایانـەی سیـستەمێکی تۆتالیتـاری و خێڵـەکی بـەرێوەی دەبات و دیموکراسیەت تیایدا بونی نیە ! چونکە دەسەڵات لەم وڵاتانە خۆی بەشێکە لەسـیناریۆکە بـەو پێیـەی دەسـەڵات لەلایـەن کەسـانێکەوە بـەرێوە دەبـردرێ کـە تەمەنیان زۆر لـە سـەروی تەمـەنی گەنجێتیەوەیـەو گـەنجێتی خۆشـیان بـە خنکـاوی بردۆتەسەر ! بۆیە ئامادەنینە دان بەم هەقیقەتە دابنێن کە تەمەنی گەنجێتی لێـوان لێوە لە تازەگەری و گۆڕان . گۆڕان لە پێناو باشتر کردنی ژیانی سیاسـی و ئـابووری و

کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری ، لەبەرئەم هۆکارانەش دەسەڵاتخوازەکان ناچارن کۆمەڵێ دەستەواژەی ناشرین دەخەنە پاڵ ئەم توێژە خۆراگرە گوایە نەومیەکی سەرەڕۆبێ پرۆژەن و هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانیان لاوازە ! لەم کاتەشدا ململانێکە رووە راستەقینەکەی خۆی ناگرێت و کۆمەڵێ پرسی لاوەکی دەخرێتە پێش لە کاتێکدا ئەم قسانە دوورە لەراستیەوە و تەنیا ووتەی کەسانێکن کەلە لەدەستدانی کورسیە شڕەکەی خۆیان دەترسن ، بەپێچەوانەوە لاوان یاخین لەو یاسا چەوتانە ! لەو ناعەدالەتیەی کۆمەڵایەتی لەو هەموو بەحیزبی کردن و قورخکردنە ، لەو فەوزا سیاسیە ! هەموومان ئەوەباش دەزانین کە توێژی لاوان گەورەترین لەشکری هێزو داهێنانن لەوڵاتدا ، لەرابردوو لەئێستاشدا لاوان قوربانیەکی زۆری داوە و بەخوێن و بازووی ئەو ئەم وڵاتە سەرلەنوێ بنیادندایەوە ، کەچی هیچ بایەخێك بەم توێژە خۆراگرە نادرێت کەپڕاوپڕە لەهەستی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری ! پەراوێزخستنی ئەم توێژە لەلایەن دەسەڵاتەوە وەك لەدەستدانی عەقڵ و دڵی مرۆڤێکەکە لەدواییدا تەنیا جەستەیەکی ساردو سڕو بێ گیان دەمێنێەوە ، چونکە ئەم دەستکەوتانەی ئێستامان بەهەوڵ و تێکۆشان و قوربانی دانی گەنجانەوە هاتۆتە بەرهەم ، هەر ئەوانیش دەتوانن بیانپارێزن و گەشەی پێبدەن . ئەم جۆرە ململانێیەش مێژوو‌ییەکی دوورو درێژی هەیە و هەموو کات دەسەڵات حەزدەکات نەومیەکی گوێگر دروست بکات و ئەوەی ئەو بیڵێت پەسندبکرێت ، نەك نەومیەکی هۆشیار و رەخنەگر! ئەمرۆ ئەم توێژە بەرفراوانە کەوتۆتە نێو کۆمەڵێ کێشەو گرفت کەلەئاست تواناکانیا بەدەرو گەر دەسەڵات بەپلانێکی تۆکمەو سەردەمیانە بیرنەکاتەوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان ، ئەوە رەنگدانەوەی خراپی دەبێت لەسەر کەسایەتی خودی لاوان و داهاتووی کۆمەڵگاکەشمان ! راستە هەندێ کار ئەنجام دراوە لەبەرژەوەندی گشتی دایە و بەدەیان پرۆژەی بیناسازی شەڕلەگەڵ هەورەتریشقە دەکەن ! بەلام بەلاوان چی ؟ کاتێك خۆی خاوەنی بستێك زەوی و داهاتێکی سەربەخۆ نەبێت ، خەڵکانێکیش هەر بەداهاتی ئەو دەبنە خاوەنی کۆشك و تەلارو

کۆمپانیـای دەولی ، گـەورەترین کێـشەی دونیـای لاوان ئـەمرۆ لـەو وڵاتـەی ئێمـە کەسیاسەتمەدار و مشەخۆران بەبەهەشت نـاوی دەبـەن بـونی جیاوازیـەکی گەورەیـە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵ بەگشتی و پیاوانی دەسەڵات بەتایبەتی ، ئەم جیاوازیە زۆر زەقترو ناشرینترە لـەململانێی چینایەتی چونکە کێشەکان رۆژبـەرۆژ زیاتر پـەرە دەسـێنێ و خەڵکەکـە بـێ ئومێـدتر دەکـات ، لەبەرامبـەر دەسـەڵات و ئاینـدە ! بەتایبـەتیش گرفتـی دارایـی کـە بـەناوی بـازاری ئـازاد ، خەریکـە کـەرتی تایبـەت و بازرگانەکان حکومەت ناشرینتر دەکەن و ئـەو کۆمپانیـاو کارگانـەی فرۆشـراونەتەوە کـەرتی تایبـەت بـەئارەزووی خۆیـان سـەدان گـەنجی کرێکـاری کـورد لـەو شـوێنانە دەردەکرێـت و کرێکـاری بیـانی لـە شـوێنیان دادەمـەزرێت جگـە لـەو دێوەزمەیـەی خەریکـە بـەناوی بـازاری ئـازادەوە هـەمووومان دەهـارێ ! ئـەمرۆ لاوان لـەناو دەیـان کێـشەی تـری وەك کـەمی هاوسـەر گـیری و زۆری قـەیرە کـچی و نـەبونی شـوێنی نیـشتەجێ بـوون و دیـاردەی کـۆچ و بێکـاری و دەیـان و سـەدان کێـشەی دیکـەی کۆمەڵایەتی دەتلێنەوە ! کوا ئەو کارگە گەورانەی حکومـەت بـەهێز دەکات و ئێمـەی لاوانیش بێ کارناکات ؟! بێگومـان دروسـتبوونی ئـەو هـەموو قەیرانـە پێویـستی بـە راوێـژ و دیـالۆگ هەیـە لـە نێوان توێـژەکان بـە تایبـەتیش توێـژی لاوان کـە پرشـکی گـەورەیان بەرکـەوتووە لـەو هـەموو قەیرانـە ، بۆیـە پێویـستە دەسـەڵاتداران زەمینەیەکی زیاتر برەخـسێنن بـۆ بەیەکـەوە کـارکردن و شـەفافیەتکردنی دەسـەڵات دەبـێ هـەموو لایـەکمان ئـەو راسـتیەش بـزانین جگـە لـەو هۆکارانـەی کـە لەسـەرەوە باسکراوە کە بونەتە بەربەست لەبـەردەم ژیـانی گـەنجانمان ئـەوا خـودی لاوانیـشمان هۆکـارن بـۆ تەشـەنەکردنی گرفتـەکان ! چـونکە لـە زۆر کاتـدا لاوان ملکەچـی داب و نەریتەکانن و بێ دەنگن لەئاست ئەو هەموو گرفتە ! لەهەمان کاتدا زۆربەی لاوانمان لـەرووی هۆشیاری و رۆشـنبیری بـەپێی پێویـست نینـە و بەبـەڵێ و نـەخێری حـزب گەشـە دەکـەن و کـۆك نـین لەسـەر خاڵـە جەوهەرییـەکان ! هەرچـەندە ئـەمرۆ نوخبەیـەکی باشـی لاوان دەیـەوێت بەشـێکی کاریگـەر بێـت لـە نێوەنـدی دەسـەڵات و

بڕیارداندا بۆ ئەوەی ژیان جوانتر بکات ، بەلاّم ئەم نوخبەیە پێویستی بە پالّپشتی زیاتر هەیە ، چونکە (گۆڕان) لەسیستەمە چەق بەستوەکان پێویستی بەخۆ ڕێکخستن و گۆشکردنێکی زیاتر هەیە ، دەبێت دەسەلاّتیش ئەوە بزانێت ناکرێت هەموو گۆڕانێك بەناشرین و لادان لە داب و نەریت بزانێ ؟! بەلّکو گۆڕان لە پێناو ژیانێکی خۆشتر جۆرێکە لە تێروانینە گەشبینیەکانی لاوان بۆ ئایندەیەکی باشتر .

# تاکەی لە شوێنی ئێمە قسە دەکرێت

لاوان فراوانترین توێژن لە کۆمەڵگادا و کاریگەر ترینیشیانەن بۆ داکۆکی کردن لە نیشتمان و پێشکەوتنی ئاستی رۆشنبیری و تەکنەلۆژیا و پێداویستیەکانی سەردەم ، لەهەر وڵاتێکدا لاوان توانیبێتیان باس لە حەزە بەندکراوەکانی ناخیان بکەن و راستگۆیانە قسە لەسەر ئێستا و داهاتوویان بکەن ، ئەوا گومانی تیانیە ئەو وڵاتە لە زۆر کێشەو گیروگرفت و مەترسیەوە دوور بووە ! جگە لە مەش ئەوە تاکێکی گۆشکراوە بە زمانی لێك حاڵی بون و رێزگرتن لە مافی یەکتر و بەیەکەوە کارکردن لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی پەروەردەدە دەکات کاتێکیش ئەم ئاستە بەرزە لە نێوان تاکی کۆمەڵ هەبێت ئەوا بێگومان راستەوخۆ دەتوانن خواست و پێداویستی یەکانی خۆیان زاڵکەن بەسەر دەسەڵات! وە ئەگەر کەسانی دەسەڵاتیش باوەریان بە گۆرانکاری هەبێت ئەوا بە هەردوو لایەن دەتوانن نەوەیەکی سەرکەوتو بنیاد بنێن و هەموو کارێك ئەنجام بدەن لە پێناو باشتر کردنی ژیان و پاراستنی تاکەکان ، بەڵام کاتێك دەسەڵات بەئەقڵیەتێکی دۆگما بەرێوە بچێ هەموو شتێك بکات لە پێناو مانەوەی خۆیدا ئەوا گومانی تیانیە ئەم وڵاتە دەکەوێتە بەر دارو خانو بێبەهایی مرۆڤەکان و لانەی شەرۆ شۆرو بەرەنگار بوونەوەی دەنگی نارەزایی و زیادکردنی دەزگاکانی سەرکوت کردن و بەندیخانەکان لە شوێنی کردنەوەی هۆڵ و پارك و سەنتەر و کتێبخانەی تازە! لە مێژووی هەموو وڵاتێکدا لاوان داینەمۆ بونە بۆ وەدەست هێنانی دەسکەوتەکانی وڵاتەکە، بەڵام هەرزوو بەناوی دەسەڵاتی حزب و سەرۆك خێڵ و پیاوی ئاینی پیاوی بەئەزموون و بەتەمەن گەورە دەبنە خاوەنیان و

ئەوان بۆیان هەیە ڕێنمایی چۆنیەتی هەڵسوکەوت و قسە لەسەر ژیانی لاوان بکەن نەك ئێمەی لاو داوای ماف و پێداویستیەکانی خۆمان بکەین گوێگرتن لە توێژی لاوان و ڕێکخراوە پیشەیی و دیموکراتیەکان ئەمرۆ لە کوردستانی ئێمەدا گرنگە ، چۆنکە هەموو لایەکمان بەرپرسین لە بەرەو پێشەوە بردن و پاراستنی ئەم ئەزموونە ، کاتێکیش کە باس لە کۆمەڵگای مەدەنی دەکرێت ئەبێ ڕۆڵی ڕێکخراوە فشار بەرەکان فەرامۆش نەکرێت ، ئەوان نوێنەری توێژەکا نیانن و بە ئەقڵی ئەوان بیر دەکەنەوە نەك دەسەلات لە لوتکەی هەڕەمەکە بێت و لە شوێنی ئێمە قسە بکات . دوا قسەم ئەوەیە لە ولآتانی ئەوروپا تەنانەت باوك و دایك ناتوانن لە شوێنی رۆڵەکانیان قسە بکەن بۆ دەبێ لە ولآتەکەی ئێمەدا لە شوێنی (٣-٤) ملیۆن کەس بیر بکرێتەوە و قسە بکرێت .

## با ئەم بێدەنگیە بشکێنین ..!

لەهەر ووتێکدا چین و توێژەکانی توانیبیتیان راستگۆیانە و چاونەترسانە باس لە ئێستا و ئایندەی خۆیان و نەوەکانیان بکەن و جەخت بخەنە سەر دەسەلآت بۆ جێبەجێ کردنی داواکانیان یاخود پاشگەز بوونەوەی لە بڕیارێك کەلە بەرژەوەندی گشتی نەبێت بەمەرجێ دەسەلآتیش پەیرەوی دیموکراسیەت بکات و رێز لەراو بۆ چونی جیا بگرێت ئەو ولآتە لە زۆر کێشە و گیروگرفت و مەترسیەوە دوور دەبێت و زەمینە لە بارتر دەبێت بۆ پەروەردە و رۆشنبیرکردنی ئاستی تاکەکانی و گۆشکردنیان بەزمانی لێك حالّی بوون و رێزگرتن لە مافی یەکتر و قەبول کردنی جیاوازیەکان لە پێناو بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانیان ! کە ئەم ئاستە بەرزەش لە نێو کۆمەلّ هەبێت گومانی تیانیە هەر تاکێك لەشوێنی خۆی دەورێکی بالآ دەگێرێ و خۆی بەبەرپرس دەزانێت بەرامبەر هەموو خۆشی و ناخۆشیەکانی ولآتەکە ! جگە لەمەش بەردەوام وەك چاودێرێك وایە لەسەر دەسەلات بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ، بەم شێوەیەش هەم خودی تاك دەتوانێ داواکانی زالّ کات بەسەر دەسەلآت هەم دەسەلآتیش کراوە دەبێت لەبەر فشاری جەماوەر ! واتە تاك بەئەرکی خۆی هەلّدەستێ و داوای مافەکانی خۆشی دەکات! بۆیە دەسەلآتیش بەجدی بیر لە خۆشگوزەرانی و زەمانەتی ژیانی تاکەکانی دەکاتەوە ، بەلآم کە دەسەلآت بە ئەقلیەتێکی دۆگی بەرێوەبچێ و هەموو شتێ ئەنجام بدات لە پێناو مانەوەی خۆیدا ! ئەو وولآتە دەبێتە لانەی شەڕو بێبەهایی مرۆڤەکان و بەرەنگار بونەوەی دەنگی نارەزایی و زایاتر کردنی بەندیخانەکان و دەزگاکانی سەرکوتکردن! لەم کاتەشدا پێویست بەیەك دەنگی و یەك ریزی جەماوەر دەکات بۆ بەدەست

هێنانی مافەکانیان بەتایبەتیش جولانەوەی توێژی لاوان کە توێـژێکی کاریگـەرن بـۆ گۆرانکاریەکان ، مێژووی هەر نەتەوەیەکیش بخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە لاوان داینەمۆ بونە بۆ بەرگری لـە نیـشتمان و ئـازادی و دەسـکەوتەکانی ، ئـەم راسـتیە لـە نیشتمانە لەتکراوەکەی ئێمەش نکۆڵی لێناکرێت ، بـەلام لـە شـوێنی خۆشـگوزەرانی و پاداشت دانەوە بۆ لاوانمان هەر زوو دەسەلات قورغکرایەوە بـەناوی هیمەنـەی حـزب و(هێز) بوو بە خاوەنی دەسـکەوتەکان و پالـەوانی نیـشتمان ، چـونکە لـە وولاتەکـەی ئێمە دەسەلات بەمانای رەفاهیەت و مانەوەی حزب بیری لێدەکرێتـەوە نـەك مانـدوو بوون و خزمەت کردن، ئەم جۆرە بیرکردنەوەش زۆر زحمەتە رێگە بـە گۆڕانکـاری و دیموکراسیەت بدات ، هەر چـەندە حـزب بـۆ جـوانترکردنی رووخـساری بەیموکراسـی کردنی خۆی رادەگەیەنێ و گەمەی هەلبژاردن دەکەن ئەو گەمەیەی کە پێـشووەختە دەزانێت ، ئەنجامەکەی چۆنە !

لێرە هەموو شـتەکان بونەتـە مـولکی حـزب و حـزبش لەسـەرووی هـەموو بـەهاکانی ئینسانە ، بۆیە گرنگە ئەمرۆ رۆشـنبیران و لاوانمـان بـەرۆلی خۆیـان هەلـسن و فـشار بخەنە سەر دەسەلات بۆ قولتر کردنەوەی دیموکراتییەت و بەیەکـەوە ژیـان دوور لـە حزبایـەتی تەسـك و مەسـەلە فیکـری و سیاسـییەکان ! ئـەم جـۆرە بێـدەنگی و کەنارگیریەی تاکی کوردی جۆرێکە لـە قـەبوڵ کردنـی ئازارەکـان و دلنیامـە زۆربـەی لاوان و رۆشنبیرانمان لە ناخیاندا چونکە هەست بە گۆڕان کاری ناکـەن تـەنیا بـیر لـە رووخـان دەکەنـەوەو رۆژ بـەرۆژیش کێـشەو گیروگرفتـی زیـاتر دەبێـت ، ئەمـەش جۆرێکـە لـە ئـازاری دەروونـی کەلەلایـەن دەسـەلاتەوە دەکرێتـە سـەرتاك ئـەم جـۆرە ئازارەش کاریگەری زیاترە لەسەر مرۆڤ لە ئازاری جەستەیی .

# بێ دەنگیت بەشێکە لە پەراوێزخستنت!

ئەگەر بەوردی سەرنجی تەمەن و جەستەو پێکهاتەو عەقلی گەنجێك بکەین لە چاو تەمەن و جەستەو خواست و ویستی کەسێکی بە تەمەن، ئەوە دڵنیا دەبین لەوەی تەمەنی گەنجێتی پڕاوپڕە لە حەزو خولیاو شکاندنی بەربەستە دروستکراوەکانی داب و نەریت و ئایین....... هتد.

کەواتە گەنج جگە لەوەی لەڕووی جەستەوە پڕە لە فشار بۆ هێور کردنەوەی حەزو خولیاکانی ئەوا لە هەمان کاتدا وزەیەکی لەبن نەهاتووشە بۆ هێنانەدی ئەم مافانە، ئەمە جگە لەوەی خودی گەنج لەشکرێکی خۆراگریشە بۆ داکۆکی کردن لە نیشتمان و نەتەوەو.....هتد. بۆیە دەتوانین بڵێین گەنج بەهەموو پێکهاتەکانیەوە پڕاو پڕە لە بەرهەم هێنان و تازەگەری لە رووی جەستەو فیکری و سیاسی و ئابوریەوە، کە ئەمەش تواناو بیر کردنەوەی خودی گەنج بێت، ناکرێت لەلایەن نێوەندەکانی بڕیاردان پەراوێز بخرێن، بەڵکو دەبێت زەمینەی باشترو خزمەتی زیاتری ئەم توێژە بەرفرانە بکەن، چونکە هەر ئەم گەنجانە بەیانی دەبنە بەرپرسی داهاتوی کۆمەڵگاکەیان، بەداخەوە لە کۆمەڵگاکەی ئێمەدا هیچ بەهایەك بۆ ئەم توێژە بەرفراوانە دانانرێت، بە پێچەوانەوە زۆرجار بەر تیرو توانجی ئەو وتار بێژانە دەکەون کە گەنج بە گێرە شێوێن و سەرەڕۆو نەفام و بێ ئەزموون دەزانن و رووتیان دەکەنەوە لە هەستی نیشتمانی و نەتەوە پەروەری. گومانی تیا نییە ئەم جۆرە قسانە تەنیا بەبێ نرخ زانینی گەنجە ئەمەش لەترسی کورسیە شرەکەی خۆیەتی، بۆیە گرنگە خودی گەنجانمان لە شوێنی ئەم بێ دەنگیەی ئێستایان

هەڵوەستەبکەن بۆ هێنانەدی خواستەکانیان و بەشێوەیەکی سەردەمیانە جەخت لە نێوەندەکانی بڕیاردان بکەنەوە بۆ زەمینە رەخساندن و هاوکاری کردنی زیاتری ئەم توێژە، لەهەمان کاتدا بیر لەوە بکەنەوە خودی گەنجان بگەنە نێوەندی بڕیاردان، چونکە پەراوێز خستنی گەنج لەم رۆژگارە ئەوەیە کە خودی حزب ئیحتکاری هەموو نێوەندەکانی کردووە و بەناوی هەموومانەوە قسە دەکات، بۆیە ناکرێت گەنج لەمە زیاتر بێ دەنگ بێت، بەڵکو دەبێت خۆی رێکبخاتەوە و وەك (چاودێرێك) بڕوانێتە کارو کردەوەکانی حزب و حکومەتەوە و لە کاتی پێویست هەڵوێست وەرگرێت بۆ رێگە گرتن لە تاك رەوی و دیکتاتۆرییەت.

# راپەڕین بەرهەمی خوێنی گەنجانە

راپەڕین سەروەرییەكی تری مێژووی گەلی كوردمانەو هەر چوار پارچەی كوردستان بە دەستكەوتێكی نیشتمانیی و نەتەوەیی هەڵی دەسەنگێنن، چونكە لایان وایە ئەم ئەزموونە ئاسۆی ئایندەی كوردستانی گەورەیە، ئەمەش راستییەكی حاشا هەڵنەگرە، بۆیە جێگای خۆیەتی هەمووومان سەری رێزو نەوازش دابنوێنین بۆ ئەو كەسانەی بە خوێنی ئاڵی خۆیان ئەم رۆژەیان نوسیوە!

راپەڕین بەرهەمی خوێن و تێكۆشانی نەوەیەك بوو كە پڕاوپڕ بوو لە گیانی رق و كینەو تۆڵەو بەدەستهێنانی ئازادی و رزگاری لەژێر چەپۆكی رەش و درندەیی رژێمی فاشی بەعس!

نەوەیەك كە ئامادە نەبوو چیتر ببێتە قوربانی حەزە گڵاوەكانی دەسەڵاتێك كە تەنیا بەزمانی توندو تیژی و ئەنفال و لە سێدارەدان وەڵامی مافەكانی بداتەوە، ئەو نەوەیە گەیشتە ئەو دەر ئەنجامەی كە داری ئازادی دەبێت بە خوێن ئاوبدرێت، بۆیە گیانی خۆی كردە قوربانی هاونەتەوەو نیشتمانەكەی!

بێگومان ئەو نەوەیەش لە رابردوو لە ئێستاشدا وزەیەكی لەبن نەهاتووی هێزوو گۆڕانكارییەكانە كە ئەویش توێژی گەنجە، ئەگەر چاوێك بەدرێژایی شۆڕش و مێژووی رزگاریخوازی هەموو جیهاندا بگێڕین دەبینین كە گەنج یەكەمین قوربانی ئەم ململانێیەیەو لەهەندێ وڵاتدا پاداشتی ئەم قوربانییەیان دراوەتەوە، ئەویش بە بەشداری پێكردنی توێژی لاوان لە كایەكانی دەسەڵات و دەستە بەركردنی پێداویستییەكانی لاوان، بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەش دەكرێت كوردستانی خۆمان

بەنموونە وەربگرین کە ئەمڕۆ هیچ بایەخێك نادات بە توێژی گەنجان، لەکاتێکدا ئەم دەستکەوتەو پاراستن و گەشەپێدانی بەندە بە سەرجەم دانیشتوانی بە تایبەتیش توێژی لاوان کە هەم لەڕووی فیکری و تازەگەرییەوە هەم لەڕووی جەستەییەوە بەشێکی زیندوو ئەکتیڤی کۆمەڵ پێکدەهێنن، پەراوێز خستنی ئەم توێژە وەك لەدەست دانی ئەقڵ و دڵی مرۆڤێکە کە لە دوایدا تەنیا جەستەیەکی بێگیان دەبێت! بۆیە گرنگە حکومەتی هەرێم بایەخێکی زیاتر بەم توێژە بدات بۆ ئەوەی ئەم توێژەش چیتر نیشتمان جێنەهێڵێ و پەشیمان نەبێتەوە لە رابردووی پڕ لە خەبات و تێکۆشانی، بەڵکو زەمینەی باشتر بڕەخسێنێ لە هەموو بوارەکاندا بۆ ئەوەی نەوەیەکی هۆشیارو خۆ بە بەرپرس گۆش بکات بەرامبەر ئێستاو ئایندەی وڵات.

•

# لاوان هێزێکی سەرەکین لە گۆڕانکارییەکان

ئەگەری گۆرانکاری لە عێراق کەوتۆتە قۆناغێکی پراکتیك و هەموو جیهانی پێوە سەرقاڵ بووە ، بەگوێرەی لێدوانەکان نە رژێمی فاشی سەدام ئامادەیە دان بە هەبوونی چەکی کۆکوژی دانێ و بڕیارەکانی UNجێبەجێ بکات بەبێ گرفت ، نە ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیش ئامادەن دەست لەو شەڕە هەڵگرن کە پێشوەختە دەزانن تیایدا سەرکەوتوو سوودمەند دەبن ، سەرانی رژێم دەیانەوێ باوەر بە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان و وڵاتانی عەرەب بهێنن کە ئەوان بێتاوانن و ئەمە شەڕە پێیان دەفرۆشرێ ، ولاتانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیشی دەزانن قوتابیەکەی خۆیان چۆنە و چی هەیە و چیان داوە پێی چ جۆرە مەترسیەکە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەوان ، ئەگەر بڕوانینە نێو خاکی عێراقیش ئەبینین گەلی عێراق لەلایەن ئەو رژێمەوە بەهەموو شێوەیەك سەرکوتکراوە و لەسێدارە دراون و کۆمەڵ کوژو کیمیاباران و ئەنفالکراون، تەنیا بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خودی رژێم و مانەوەیان لەسەر کورسی جا بەهەر نرخێك بێت ، بۆیە گەلی عێراقیش بەبێ جیاوازی نەتەوەیی و ئایینی و فیکری چەندین ساڵە خەبات دەکات بۆ رووخانی ئەو رژێمە ، بەڵام لەبەر بەهێزی و وەڵامدانەوەی بەزەبری چەك و نەبوونی هێزێکی یەکگرتووی بەرهەڵستکاران و نەرەخسانی دەرفەتی پێویست نەتوانراوە ئەو گەلە رزگار بکەن ، گەلی عێراق لە سایەی دەسەڵاتی رژێمی دیکتاتۆری بەعس تووشی دەیان کارەسات و شەڕی داسەپاو بووە کە تیایدا تەنیا گەل تووشی کارەسات و مەرگ بووە ، جگەلەمانەش خۆی بە درندەترین شێوە مامەڵەی لەگەڵ دانیشتوانی

سەرخاکی عێراق کردووە بەلای دەسەلاتدارانی رژێم سەرکەوتن لەوەیە تۆ خاکێکی تر داگیر بکەیت و هیتلەر ئاسا بکەویتە گیانی نەتەوەکان و ببنە سەروەری جیهان و ئیمپراتۆرێکی سەدە !

کەواتە سەرکەوتن و شکست لەلای خودی سەدام و دارودەستەکەی ئەوەیە ناویان بهێنن جا بە چاکە یان خراپە ! هەر ئەو لە خۆباییەی ئەوانیشە ئەمڕۆ ولات دەکەوێتە بەر مەترسی شەڕو گۆڕەپانی تاقیکردنەوەی تازەترین چەکی ولاتان، ئەم شەڕەی کە بەرێوەیەش تەنیا سەرانی رژێم لێی بەرپرسیارن چونکە هیچ تاکێك حەز بەوە ناکات ولاتەکەی بکرێتە مەیدانی سوارچاکی شەڕ ، ناشتوانین پێش لە مەترسیەکان بگرین پێویستە هەموو لایەکمان کۆك بین لەسەر ئەوەی ئیرادەو خواستی گەلی عێراق لەبەر چاو بگیرێت و لە ئەگەری گۆرانکارییەکانی خەلکی مەدەنی زەرەرمەند نەبێت و خودی گەلی عێراق رۆلی سەرەکی ببینین و خۆشیان سەرپشك بن بۆ دامەزراندن و چۆنیەتی بەرێوەبردنی دەسەلات ، حکومەتێك کە دەنگ و ئیرادەی جەماوەر پێکی بهێنێ نەك تەنیا گۆڕینی روخساری دیکتاتۆربێت و بۆ چەندین سالی تر ئابووری ولات بۆ کرینی چەك و جبەخانە و زیندانی و ولاتانی سەرمایەدار بێت ، گەلی کورد وەك نەتەوەیەك زەرەمەندترین نەتەوە بووە لەسەر خاکی عێراق و بەدەستی پیاوانی رژێمی داگیرکەری بەعس بەر هێرشی کۆمەل کوژی و خاك داگیرکردن و ئەنفال و کیمیاباران کەوتووەو، بۆیە گرنگە ئێمە سوودمەندبین لەو ئەگەرەو بەیەك دەنگ و یەك هێز و هاوهەلوێستی جەخت لەسەر مافی رەوای گەلەکەمان بکەینەوە ، بەمافی سەربەخۆ بونیش ، هەرچەندە شەڕ کارەساتی تری بە دواوەیە و برینەکانمان قولتر دەکات و ولاتمان دەکاتە گۆڕەپانی تاقیکردنەوەی جۆرەها چەکی تازە ، جگە لەمەش زەرەرو زیانێکی مادی زۆریش بەر ئابووری ولات دەکەوێت و هەزارەها دایکی تریش رەش پۆش ئەبێت ، هەرچەندە لاوان لە زۆربەی شەڕەکانی رابردوو بە شەڕی براکوژیش تەنیا کوشتن و دیلی و کەم ئەندامێتی خەلاتی ئەوان بووە و گەنجێکی زۆر بونەتە قوربانی خواستی

شەڕفرۆشان ئەوا لەم شەڕە چاوەڕوان کراوەش توێژی لاوان هێزێکی سەرەکین لە گۆڕانکارییەکە ، گرنگە و پێویستە لاوان لەو شەڕەدا ڕۆڵیان بە فیرۆ نەڕوات و توانا و هێزیان لە داهاتوودا پشتگوێ نەخرێت و حکومەت و دەسەڵاتی ئایندە لە ئەستۆیەتی ئەو هەموو نەهامەتییەی بەسەر لاواندا هاتووە قەرەبوو بکاتەوە و کاربکات لە پێناو خزمەتکردنی زیاتر و جوانترکردنی وڵات و چارەسەر کردنی بێکاری و کۆچ و زەواج و گوێ لە حەزو داواو خۆزگەکانی لاوان بگرن ، کەواتە ئەو شەڕە جگە لەوەی شەڕی بەرژەوەندییەکانە شەڕێکە ، لە پێناو گۆڕانکاری! ئەو سیناریۆیەش تا چەند لە بەرژەوەندی گەلی عێراقدا دەبێت بەسەرجەم چین و توێژو نەتەوەکانییەوە ئەوا دەسەڵاتی داهاتوو وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە .

## وەزارەتێکی تایبەت بە لاوان پێداویستییەکی مێژووییە

ئەگەر چاوێك بە مێژووی وڵاتانی ئەوروپا و خۆرئاوا بخشێنین و سەیرێکی کابینەکانی حکومەتەکەیان بکەین بەتایبەتی لە سەدەی بیستەم ، بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەی ئەو وڵاتانە وەزیر و وەزارەتی تایبەتیان هەیە بۆ توێژی لاوان ، چونکە توێژێکی فراوانە و بە هەردوو رووی ئیجابی و سلبییەوە کاریگەری دەبێت لە داهاتووی نەتەوەکە بۆیە هەر زوو ئەو حکومەتانە وەزارەتی تایبەت رادەگەیەنن گوێ لە خەمی لاوانیان رادەگرن و داواکانیان بە هەند دەزانن و بە زووترین کات رێگا چارەیان بۆ دەدۆزنەوە ! ئەم جۆرە هاوخەمییەی حکومەتیش لەگەڵ لاوەکانیان بێگومان نەوەیەکی سەرکەوتوو دێنێتەوە مەیدان کە گۆشکرابێت بە مەسەلە دیموکراسییەکان و ئازادی تاکەکەس و شارەزایی لە بوارەکانی ژیان و رەفاهییەت ، کەواتە گەنجێکت دروست کردووە کە ئامادەیە داکۆکی لەبەهای نیشتمانی و مافەکانی خۆی و کۆمەڵگایەکی مەدەنی بکات دوور لە فشاری حزب و دەسەڵات بەڵکو پێشبڕکێ دەکەن لە پێناو بڕوانامەی بەرزتر و خزمەتی زیاتری کۆمەڵگاکەیان ، بەڵام لە کوردستانی ئێمە جگە لەوەی وەزارەتی تایبەتمان نییە ئەوا شەڕی نێوخۆو تەزکیە و تەزکیەکاری و حزبایەتی تەسك خەمەکانی لاوانی قورستر کرد و نەوەی نوێمانی نوقمی کەم و کوڕی و ترس و بێ دەنگی کرد و ئاسۆیەکی روونیان لەبەردەم دانەبوو بۆیە باشترین هەڵوێستیشیان لە دژی ئەم دیاردە ناشرینە وڵات جێ هێشتن و کۆچ کردن بووە ! لەم بارەیەوەش ئەزموونێکمان هەیە و دەتوانین بڵێین لە ساڵی ١٩٩٢ تا ئێستاش رۆژبە رۆژ کێشە و خەمی لاوانمان زیاتر

دەبێت و نەتوانراوە چارەسەر بکرێت کە دەتوانین بڵێین هۆکاری یەکەمی ئەم چارەسەرنەکردنانەش نەبوونی وەزارەتێکی تایبەت بە لاوانە بۆیە گرنگە لە دوای ئەم گۆڕانکارییە مێژووییە کەلە عێراقدا روویدا و لەلایەکی تریش بەرەو پێشەوەچوونی پرۆسەی ئاشتی و کۆبوونەوە ئاساییەکانی پەرلەمان و خۆئامادەکردن بۆ هەڵبژاردنێکی گشتی ، پێویستە پەرلەمانی داهاتوو بەجدی بیر لە پێکهێنانی وەزارەتێکی تایبەت بە لاوان بکاتە هەر ئەو وەزارەتەش دەتوانێ بەهاوکاری رێکخراوە دیموکراتی و پیشەییەکانی کوردستان کێشە و گیروگرفتەکانی لاوانی کوردستان چارەسەر بکات, گرنگیشە ئەم وەزارەتە لە کەسانی لاو پێك بێت نەك تەنیا بە جەستە و رووخسار لاو بێت ، بەڵکو دەبێ بەئەقڵ و پراکتیك لاو بێت .

# وەزارەتی وەرزش و لاوان بۆ بێدەنگی؟

هەموومان دڵنیابن لەوەی ئامانجی سەرەکی حکومەتەکان لە جیهاندا بە پلەی یەکەم باشتر کردنی ژیان و دابین کردنی خۆشگوزەرانییە بۆ تاکەکانی بە تایبەتی ئەو حکومەتانەی بە هەڵبژاردن و بەشێوەیەکی دیموکراسیانە هاتونەتە دەسەڵات !
لەو وڵاتانەی یاسا بەرقەرارەو حزب و پاڵێوراوان خاوەن بەڵێنەکانی خۆیانن ! ململانێ و پێشبڕکێیە لەسەر هێنانەدی خواستەکانی هاووڵاتیان و پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان تاک و دەسەڵات.
هەر بۆ ئەم مەبەستەش جگە لە وەزارەتە (باوەکان) چەندین وەزارەتی بەلای ئێمەوە سەیرو سەمەرەیان هەیە تەنیا بۆ کار ئاسانی و زووتر راپەڕاندنی ئەرکەکان و گواستنەوەی کێشەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوەو بە پێچەوانەوەش پەیام و خزمەتگوزارییەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە.
بێگومان (وەزارەتەکان) ئەڵقەی پەیوەندی نێوان حکومەت و هاووڵاتیانە لە رووە خزمەتگوزارییەکان و گەیاندنی پەیامی هەردوولا، لەهەمان کاتدا ئەرکی وەزارەتەکانە کە هەر وەزارەتەو بەدوای پرۆژەو پلان و کێشەو گرفتەکانی پەیوەست بە خۆیەوە بچێت و بە زووترین کات رێگا چارەی گونجاو بدۆزنەوە.
ئەگەر بە خێرایش سەیرێکی (هەرەمی) حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەین بەهەمان شێوەی حکومەتەکانی وڵاتان وەزارەتی هەیە، بەڵام سەیرەکەی لەوەدایە وەزارەتەکان ئەرک و پەیامی خۆیان نازانن یا زۆر بەسستی و لاوازییەوە کارەکان رادەپەڕێنن.

دڵنیامە هۆکاری یەکەم زاڵ بوونی عەقڵیەتی حزبایەتی تەسك بێت کە تائێستا کاری پێ دەکرێت و وەك ڤایرۆسێك خەریکە جەستەی پەرلەمان و حکومەت و وەزارەتەکان ئەتەنێتەوە، هۆکاری دووەمیشیان لاوازی خودی کاربەدەستان و زۆری و بۆری راوێژکارە بۆ سەروبەرەکانی وەزارەتەکانە کە بەداخەوە بێ ئاگان لەو هەموو گرفتەی کە پەیوەستە بە وەزارەتەکانیانەوە.

ئەگەر بە نمونە وەزارەتی (وەرزش و لاوان) وەربگرین کە دەبوایە ئەکتیف ترین وەزارەت بوایە لە دوای وەزارەتی رۆشنبیری لەڕووی رەخنەگرتن و پێشنیازو داواکاری و هەڵوێست وەرگرتن لەبەرامبەر ئەو هەموو کێشەو قەیرانەی لاوانی تیا ئالاوە !

کەچی بەداخەوە بێ دەنگترین وەزارەتە لەمەڕ کێشەی چین و توێژەکەی خۆی، لەهەمان کاتدا ئامادەنییە جگە لە چەند رێکخراوێکی دیاریکراو بەدەنگ خواست و پێشنیازو داواکاری رێکخراوەکانی تری گەنجانەوە بچێت.

## گەورەم ئەوە زمانی ئاخاوتن نییە !

زۆرم پێ سەیرە! لەوەتەی بیردەکەمەوە و هاتوومەتە نێو کاری ڕێکخراوەی و سیاسی و ڕۆژنامەنووسی! لەوەتەی هەستم بە بوونی خۆم کردووە وەك مرۆڤێك لە کۆمەڵگاکەی لەمەڕ ئێمە ، هەموو بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان و مەوکیبە سیاسییەکان و داهاتە ئابووریە گشتیەکان بەدەست کۆمەڵێ کەسێکەوەیە کە ناتوانن بە عەدالەتی بەڕێوەی ببەن و خاوەن ئەو پەیامە بن کە بەهەوا دارانیان داوە !

بەلامەوە سەیرە منداڵێك جلی نییە بۆ قوتابخانە ! یەکێکی تر وازی لە خوێندن هێناوە و دایك و خوشك و برابچوکەکانی بەخێو دەکات لەبەر ئەوەی باوکی لەشەڕی نەگریسی برا کوژی کوژرا، بەسەدانی تر گوڵە بەرۆژەو جگەرە دەفرۆشن کە ڕۆڵەی ئەم خاکەن و پێویستە حکومەت نازی منداڵێتیان هەڵگرێ بۆ ئەوەی نەوەیەکی تەندروستی بۆ دوارۆژ هەبێ !

دڵنیامە ئێوە ئەو ڕاستییە دەزانن نوخبەیەکی وەك ئێوە نەبێ ! ئێستاش هەموومان بە کرێکاری و حەماڵی و شەونخونی و زەحمەتییەکی زۆرەوە ژیان بەسەر دەبەین ! ئەزانی گەورەم لەکرێکارێکی (کاتی) شارەوانییان پرسی کە خەیکی پاك کردنەوەی شەقامەکانی شاربوو چەند وەردەگری ؟ گوتی لە بری سێ شەفت کارکردن لە(٨)ی بەیانی بۆ(١١)ی شەو (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار دینار وەردەگرم بۆ بەخێو کردنی شەش سەر خێزان لە باوك و دایك و خوشك و براکانم ! ئەزانی گەورەم لە هەمووشی سەیر تر ئاواتی ئەوە بوو ژنێك بێنێ و کارەکەشی بەردەوام بێ دەری نەکەن !

گەورەکانم ئایا ئێوە ئاگادارن کە ڕێژەی قەیرە کچی لەو پەڕی بەرزی دایە و ساڵی (٢٠٠٧)یش زۆرترین گەنجی کوڕ سنورداش کراونەتەوە! ئەی ئێوە دەزانن بەدەیان منداڵ ئێستا دوورە لە سۆزی دایك و باوکی چونکە خێزانەکەیان لێك هەڵوەشاوەتەوە لەبەر کێشەی ئابووری ! ئەی ئێوە دەزانن لەهەر خانوویەکی (٢٠٠)م دوو تا سێ خێزانی تیا دەژی و بەدەیان گرفتی کۆمەڵایەتی دروستکردووە ! باسی کەمی موچەشتان بۆ ناکەم لەبەر ئەوەی خۆتان موچەکانی ئێمەو ئێوە دیاری دەکەن ! لەوەش دڵنیاین کە دەنگی ئێمەیە ئێوە دەگەیەنێتە سەرکردایەتی حزبەکان و پلەی بەرپرسیارێتی حکومی! هەر ئێمەش دەتوانین بتانپارێزین !

گەورەم دەبێ ئەوە بزانن کە هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان من وتۆ ، لە نێوان منداڵەکانی ئێمە و ئێوە ! بەڵام چی بکەم کلتوری ئێمە وایە هەرکاتێ پلەی بەرپرسیارێتی درا بەکەسێك لەشوێنی هاتنە نێو جەماوەر پەرژینێك لە پاسەوان و سوپایەك لە چەکدار لە دەوری خۆی و ماڵ و منداڵەکەی کۆدەکاتەوە و بەرژەوەندی شەخسی دەخاتە پێش بەرژەوەندی گشتی !

گەورەم ئێمە ئەزانین شەوە پەمەییەکانی خۆتان و ماڵ و منداڵەکانتان و کۆشك و کۆمپانیاکانی ئێرە و ئەوروپا بەرەنجی ئێمە بنیاد نراون ! بۆیە چیتر بەلاوانی ئێمە مەڵێن تەمبەڵ و تەوەزەل و گەمژە، چونکە ئەمە زمانی ئاخاوتنی سیاسی و ئەدەبی نییە ! بەڵکو گەورەیی لای مرۆڤی گەورە وەك (پیرەمێرد) وتەنی:

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا لە راستی موچە خۆری خۆی

صوراعی سەر فرو دێنێ لە بۆ پیاڵەکە تێکا بۆی

# گەمەی گەورەکان

ئێمەی کورد لە سەرەتاوە جیاوازییەکی بەرچاو دەکەین لە پەروەردەکردنی هەر دوو ڕەگەزی منداڵ ، هەر لە جۆری یاریکردن، خۆێندن، جلوبەرگ، خۆشەویستی فێرکردن .. هتد ئەتوانم بڵێم ئەو جیاوازیەش هۆی سەرەکییە لەنیشاندانی ئافرەت بەبێ هێزی و بێ توانا ،پیاویش بە پێچەوانەوە هەر ئەمەشە وا لە پیاو ئەکات بەلە خۆباییەوە بێتە مەیدان و حەزی بە هەر یارییەك بێت ئەنجامی بدات ! بەلام یاری گەورەکان لەگەڵ منداڵەکان جیاوازە! منداڵەکان لەبەر بچووکی تەمەن و کات بەسەربردن و خۆخافلاندن چێژ لە یارییەکان وەردەگرێت ، هەرچی یاری گەورەکانە بۆ کات بەسەربردن نیە ، چونکە تەمەنێکی گونجاوی هەیە بۆ کاروخوێندنەوەو بەهەوەسی خۆی هەموو شتێ ئەنجام بدات! بچێتە هەموو شوێنێك بەبێ ئەوەی ونیش بێت ! یاری گەورەکان ئەوەیە کە خۆیان ئەنجامی ئەدەن تا بیسەلمێنن کە هەن و هەموو شتێکیان پێ ئەکرێ ! لێرەدا لێکچوونێ هەیە لە نێوان یاری بچووکەکان و گەورەکان ئەویش چێژ وەرگرتنە، بچووکەکان لە پاکیزەیی خۆیان چێژ لە یاریکردنەکە وەردەگرن بەبێ ئەوەی زەرەر لە دەوروبەر بکەوێت ،هەرچی چێژی گەورەکانە وانییە بەڵکو بە ڕوحیانەتێکی پڕ لە ڕق و تۆڵە و شەڕو کوشتن و خیانەت و خۆ بەگەورە و پیاوزانین و داگیرکردنە!

بەتایبەتی گەمەی سیاسی ، دیموکراسی ، شۆڤێنی ، سەلەفی ، بازرگانی ، پیاوسالاری..هتد. لە کۆمەڵگای ئێمە پیاوی گەورە بۆ سەلماندنی پیاوەتییەکەی بۆی هەیە یاری بە چارەنووسی منداڵەکانییەوە بکات هەر لە ناو لێنان، خوێندن و

نەخوێنــدن ،گەورەبەبــچوك ، ژن بــە ژن بــەبێ ئــەوەی رەزامەنــدی کــچەو کورەکــە وەربگرێت ! گەورەکانی ئێمـە لـە پێنـاو سـەرکەوتنی قسەکانیان و سـوودمەند بـوون ئامادەن یاری بە وزەی کارەباوە بکەن کە مولکی جەماوەرە بـۆ پرکردنـی قاسـەکانیان ! گەورەکانی ئێمە باج و سەرانەو گومرگ لە نێوان شارەکان وەردەگـرن سـوتەمەنی و دۆلار و تاك دیناری کاغەز بەرز دەکەنەوە هـەر بـۆ ئـەوەی خـەڵکیش پرسـی نـەبێت داهاتەکان بۆ بەرژەوەندی و رەفاهیەتی خەڵك سـەرف دەکەنـەوە ! گـەورەکانی ئێمـە لە پێناو براوەیی و مانەوەی خۆی وەك یاری چییەك لە گۆڕەپانەکە کۆمـەڵێ فـێڵ و تاکتیك و تەزکیەو بە حزبی بوون و فـشار وەك هونـەرێك نیـشان دەدات ! وا ئـەزانێ هەمووومان لە هونەری شانۆگەری حاڵی نابین !

گەورەکانی ئێمە دڵسۆزیان بۆ خەڵکانی سەربەخۆیان زەوی و یارمـەتی دەبەخـشنەوە ! لـە کاتێـك دا هـەزارەها ژنــە شـەهید و فەرمانبــەر و مامۆسـتاو خـەڵکانی هـەژارو نیـشتمان پـەروەر هەیـە بـستێك زەوی نییـە لـەم کوردسـتانە بـۆ ئـەوەی وڵاتـی لـەلا شیرنترو جوانتر بێت! هەر گەمەی گەورەکانیش بوو(٨) ساڵ نەوەی تازەی فێرە رق و کینـەوە شـەڕ کـردن و بەهـەزاران گـەنجی تیـا کـوژراو بەهـەزارانی تـری بـێ ئومێـدو سـەرگەردانی وڵاتـان کـرد و هـەزاران دایکیـشی جـەرگ سـووتاو هـەزاران منداڵیـشی هەتیو کـرد! گەورەکانی ئێمـە تـەنیا بـۆ جوان کردنـی دەسـەڵات و رووخـساریان بـە دیموکراسی کردنی خۆیان رادەگەیەنن و گەمـەی هەڵبـژاردن دەکـەن ! گەمەیـەك کـە هـەمومان دەزانـین فێڵمـان لێ دەکـەن! گەمەیـەك کـە زۆربـەمان بـە شـەق و هەڕەشـە دەنـگ دەدەیـن! گەمەیـەك کـە تـەنیا لـە پێنـاوی دەنگـە! گەمەیـەك کـە لـە دواییـدا ناوێرین بڵێین کوا بەلێنەکانتان ! جگە لەو یاریانەی بە ناوی دیموکراسیەوە دەکرێت مەترسیدار ترین یاریش گەمەی گەورە سەلەفیەکانە کاتێـك بڕیـار دەدەن گەمەیـەك بکەن بـە زەبـری شمـشێر بـراوە بـن ! ئـەو براوەیـەیی تیایـدا ئێمـە بـە خوانـەناس و خۆشیان بـە زمانحـاڵ بـزانن ! ئەمانـە هەنـدێ لـەو یارییانەیـە کـە گـەورەکانی ئێمـە ئەنجامیانداوە و دەیدەن بۆ نیشان دانی جوانترین لەش و لارو بەهێزترین ماسولکە !

توێژی لاوانیش لەم نێوەندە وەك تەماشەکەرێك سەری سوڕماوە هەندێکیان لە کەم زانینیان بەشدارن وەك کارەکتەرێك و یاریزانێکی گەورە فێرکاران ! هەندێکیشیان هەست بە و یاریە دۆڕاو و مەترسیدارانە دەکەن بەڵام تا ئێستا دەنگیان بەرز نەکردۆتەوە ! قسە لەسەر ئەوە هەیە گەمەیەکی چارەنوسساز بەڕێوەیە کە ئەویش گەمەی گەورەکانە بۆ شەڕێکی مەترسیدار لە عێراق ، لەم گەمەیەش دیارە کێ کش مەلیك دەکات ، کێ تیایدا زەرەرمەند دەبێ و کێ ئەمجارەیان داهاتی وڵات بە تاڵان دەبات! تا ئێمەی لاوان و رۆشنبیران و سەرجەم چین و توێژەکانیش ئاوا بێ دەنگ بین ئەبێ چاوەڕێی گەمەی تری گەورەکان بین.

# کێشەکانی گەنج لە کۆمەڵگەی ئێمەدا

## بێکاری

ڕەنگە بڵێین بێکاری بەشێکی گەورە و کاریگەربێت لەسەر دروست بون و گەشەکردنی کێشەکانی تری گەنج ، چونکە بێکاری جگە لەوەی گەنجێکی بەجەستە تەمبەڵ و مشەخۆر بنیاد دەنێ لەهەمان کاتدا هێزێکی کاریگەری کۆمەڵگا لەرووی جەستەیی و فیکری وون دەبێ کە ئەمەشیان روویەکی سلبیە لەنێو کۆمەڵگا تازە فراژوو بووەکان ، بێگومان بەردەوام بونی ئەم دیاردەیەش کێشە و گیروگرفتی تری بەدوا دادێت کە ئاکامەکەی خراپترە لە سەرەتای بیرکردنەوەی بێکارییەکە ، چونکە گەنجێك کە لە قۆناغی گەشەی فکری و جەستەیی بێت ، بەڵام خاوەنی ئابوورییەکی سەربەخۆ نەبێ ئەوا گومانی تیا نییە ئەم گەنجە کەسایەتییەکی رووخاوو بێ هیواو هەندێ جاریش مل کەچ دەبێت لەبەرامبەر پێشهاتە کۆمەڵایەتییەکان و سیاسیەکان ! بۆیە ناچارە یان بێ دەنگ دەبێ و رۆڵی خۆی نابینێ یان بیر لەرزگار بوون و لە لەزەتە کاتییەکان بکاتەوە جا بەهەر قوربانی دانێك بێت .

## نەبوونی شوێنی کات بەسەربردن و پشودان

راستە دیاردەی بێکاری قۆناغێکی کاتییە لەگەڵ گەشەی حکومەتە تازە فراژووبوەکان نامێنێ و ئەم حکومەتە پلانی گونجاو دادەرێژێ بۆ سوود بینین لەم هێزە لەبن نەهاتووە ، رەنگە بچوکترین هەنگاویش کە ئەو دەسەڵاتانە دەیبینن کردنەوەی یانەو پارك و شوێنی گشتی بۆ هۆشیارکردنەوەو کات بەسەر بردنی لاوان تا توشی کێشەی دەرونی و لادانی کۆمەڵایەتی و تاوانی قەزایی نەبن ، وەئەم شوێنانەش یان بوخۆراییە یان برێکی کەم وەك یانەیەکی هاورێیەتی بۆ سوود بینین لە بنیاد نانەوەی خودی گەنجەکان ئەویش بە کردنەوەی خولی جۆراوجۆر لە

(کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و زمان و مۆسیقا و ....هتد) وەئەوەی لە هەمووشیان گرنگترە ئەم شوێنە گشتیانە شوێنی گەشەکردن و هۆشیارکردنەوەیە نەك رووخان و لادانە کۆمەلایەتییەکان .

## گەنج و پرۆسەی هاوسەرگیری

هاوسەرگیری وەك بنەمایەکی کۆمەلایەتی لە کۆمەلگاکەی ئێمە سەیر دەکرێت لەهەمان کاتدا وەك یاسایەکی سەلێندراو لەبواری بەردەوام بون و گەشەکردنی ژیانی مرۆڤیاتی ، وەك پێویستییەکی جەستەیی و لە هەندێ کاتدا دەروونی و روحیش بونی گرنگە لە نێوان هەردوو رەگەز بۆ هاوکاری و تەواوکردن و جوانترکردنی ژیانی رۆژانەیان ، دەبێ ئەم راستیەش بزانین هاوسەرگیری لەنێوان مرۆڤەکان تەنها مەبەستە (سێکسیە)کە نییە ! بەلکو ئەمە ژیان سەلماندویەتی کە هەردوو رەگەز جگە لە کپ کردنەوەی جەستەیی پێویستەیەکی کۆمەلایەتی و شارستانیشە ، هەرچەندە ئەم پرۆسەیە لە کۆمەلگایەك بۆ کۆمەلگایەکی تر جیاوازی هەیە هەم لەرووە کۆمەلایەتییەکەی هەم لە رووە یاساییەکەی! ئەگەر سەیرێکی کۆمەلگای خۆمان بکەین لەرووە ئاینییەکەی و کۆمەلایەتییەکەی بەربەستێکی گەورەن لەبەردەم ئازادییەکانی تاك بۆیە زۆرجار ئەم بەربەستە هەلەی گەورەتری لێکەوتۆتەوە چ بە کوشتن یان بە زیندانی و دروست بوونی کێشەی کۆمەلایەتی بەتایبەتی پەیوەندی هاورێیەتی نێوان هەردوو رەگەز ، هەر ئەم ترس و تۆقاندنەش دەبێتە پەلەکردن و لێك حالی نەبونی پرۆسەکە لەنێوان هەردوو رەگەزدا و سەرەتایەکە بۆ لێك هەلوەشاندنەوەی هەندێك لە پرۆسەی هاوسەرگیریەکان ، چونکە رێژەیەکی زۆر لە هاوسەرەکان لە هەردوو رەگەزدا پالنەری سەرەکیان لەم پرۆسەیەدا (کپ کردنەوەی حەزە سێکسییەکانە) نەك بنەما جوانەکەی هاوسەرگری وەهەندێ جاریش هۆکاری بەزۆر بەشودان و ژن هێنان و گەورە بەبچوك و ژن بەژن دەبنە هۆی (لادانی سێکسی)و(خیانەتی هاوسەری) و لێك

هەڵوەشانەوەی ئەم هاوسەرگیریە و لە ئەنجامدا ڕێژەی تەڵاق زیاد دەکات و بەسەدان منداڵیش لە سۆز و خۆشەویستی دایك و باوك بێ بەش دەبن ئەمەش ڕەنگدانەوەیەکی خراپی هەیە لەسەر کەسایەتی ئەو منداڵانە کە گەنجی ئایندەن ، لەهەمان کاتدا ئەم پرۆسەیە لە کۆمەڵگاکەی ئێمە هەموو ئەرکەکەی دەکەوێتە سەر ڕەگەزی نێر، هەر ئەویش بە پلەی یەکەم دەکەوێتە نێو گێژاوێکی بێ ئومێدی لە بەڕێوەبردنی خێزانێك لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی بەو هەموو زەحمەتەی ژیانەوە ، ئەم هۆکارەش وای کردووە زۆربەی گەنجە کوڕەکانمان بیر لە پرۆسەکە نەکەنەوەو ئامادەنین ژیانی هاوسەری پێکبهێنن ، بۆیە ئەگەر ئامارێکی ڕاست و دروستی ئەم پرۆسەیە بکەین دەزانین کە ڕێژەیەکی ئێجگار زۆرمان لە هەردوو ڕەگەز بەتایبەتیش (ئافرەتی بەناو قەیرە) هەیە کە ئەمەش ڕەنگ دانەوەیەکی زۆر نیگەتیف دەبێت بۆ داهاتووی ئەم کۆمەڵگایە .

**گرفتی نیشتەجی بوون**

ئەم دیاردەیە گرفتێکی زەق و بەرچاوە لەو وڵاتانەی کە سیستەمەکەیان سیستەمێکی سۆسیالستی نیە ! چونکە ئەو سیستەمانە زۆر بەتەنگ گرفتی نیشتەجێ بونی هاوڵاتیانەوە نین بەمەبەستی دروست کردن و بەخشینی خانوو یان (ئاپەرتمان) شوقە بەشێوەی قیست یان کرێی کەم ! ڕاستە هەندێ جار زەوی دەبەخشن ! بەڵام ئەمەش هەموو تەمەنێك و هەموو هاوڵاتیەك ناگرێتەوە تەنیا ئەوانە نەبن کە فەرمانبەرن یان کاربەدەست و مامۆستایەکی میرین کە ئەمانەش تا مەرجی وەرگرتنی زەوی دەیانگرێتەوە پیر و پەك کەوتە دەبن و پارەی (٢) خانوو دەدەنە کرێ !

جگە لەمەش هەر هۆکاری کەمی هاوسەرگیریش بەشێکی نەبونی شوێنی نیشتەجێ بونە ! چونکە خۆشگوزەرانی هەموو هاوڵاتیەك ئەوەیەکە لە شوێنێکی تایبەت بەخۆی کاتی پشودانی بەسەر بەرێت و ئەوشوێنەش ببێتە دوا مەنزڵگای ژیانی و

لەوە نەترسێت کە دوای یەك کەوتن و کەمی دەرامەت شوێنێك نەبێت تیایدا بژیت ! بەداخەوە زۆربەمان ئاگاداری ئەم گرفتانەین کە هۆکاری نەبونی نیشتەجێ بوون دروستی دەکات بەتایبەتیش سەرهەڵدانی گرفتە کۆمەڵایەتیەکان لەوەی کە لەخانویەکی رەنگە (٢٠٠)م دوو تا سێ خێزان تیادا بژین ئەمەش جاری وابووە بۆتە هۆی گرفتی کۆمەلایەتی وەك کوشتن و خیانەتی زەوجی و تەلاق و چەندین کێشەو گرفتی تر .

## کوشتن و خۆکوشتنی گەنجان

بێگومان لەنێوان هەموو کۆمەڵگایەك کاری خراپ و باش و تاوان و سزا هەیە، بەلام ئەم کۆمەڵگایانە هەوڵی ئەوە دەدەن کە کەسەکان رابهێنن لەسەر بنیاد نانەوەو چاکسازی کۆمەلایەتی، چونکە ناکرێ تۆ هەموو تاونێك بخەیتە ئەستۆی تاوانبارێك جا ئەم تاوانبارە هەر تاوانێکی ئەنجام دابێ ، بەڵکو دەبێت تۆ هۆکاری ئەنجامدانەکەی بزانیت و رێگاچارەی گونجاوی بۆ بدۆزیتەوە بۆ ئەوەی ئەم جۆرە تاوانە گەشە نەسێنێ ! جا ئایا تاوانەکان هۆکارە کۆمەلایەتییەکانن یان سیستەم و بەڕێوەبردنی دەوڵەت هۆکارن لەبون و گەشەی تاوانەکان ، چونکە دەبێ ئەم راستیە بزانین رەنگە (تاوانبار) و (تاوان لێکراو) لە کاتێك لە کاتەکان دەکرێ پەشیمان ببێتەوە و نەفرەت لە خۆی و کارەکەی بکات ، بەلام تاچەند حکومەت هاوکارە ئەمەیان گرنگە، بەداخەوە خۆسوتاندن و خۆکوشتنی ئافرەتان بە بیانوی (پاراستنی شەرەف) ئەوەندە پەرەی سەندوە کە خەریکە دەبێتە دیاردەیەکی زەقی نێو کۆمەڵگاکەمان و جگە لە ئافرەتان رۆژانە بە دەیان گەنجی کوڕ لە کوچە و کۆلان و دەشتەکان لاشەکانیان دەدۆزرێتەوە و هیچ هۆکارێکی رونیش دیار نییەو تاونبارێکیش دەستگیر ناکرێ ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دیاردەی خۆکوشتن بە تفەنگ و خۆهەڵواسین و خۆ ژەهراوی کردنی گەنجانی کوڕیش پەرەی سەندوە !

لەهەمان کاتدا بڵاو بونەوەی (مادده هۆش بەرەکان) لەنێو توێژی گەنجان خەریکە پەرە دەستێنێ و روحی هەزاران دەکێشێ .

## وەرزش لە نێوان خولیاو سیاسەتدا

وەرزش وەك هونەرێك یان وەك خولیایەك بۆتە بەشێکی زیندو لە کاروباری رۆژانەی هاوڵاتیان بەگشتی و توێژی لاوان بەتایبەتی ، هەرچەندە ئەم هونەرە بە هەموو جۆرەکانییەوە شتێکی تازە نییە ، بەلام ئەوەی سەرنج راکێشە ئەوەیە ئێستا هەموو جیهانی سەرقال کردووە بە تایبەتیش یاری تۆپی پێ! ئەگەر سەیرێکی کوردستانیش بکەین وا هەست دەکەین کە ئەم جۆرە یاریە وەرزش وان و وەرزش دۆستێکی ئێجگار زۆری هەیە، بەڵام ئەوەی جێگای داخ و گومانە ئەوەیە کە وەرزش لە کوردستان بۆتە بەشێك لە سیاسەتی نێوخۆ نەك سیاسەتی دەولی ، واتە لە شوێنی ئەوەی کە وەرزش وانێك بەباشی پەروەردە بکرێت و هاندانێکی زیاتری هەبێت بۆ ناساندن و بەرزکردنەوەی ئاستی وەرزشی و نەتەوەیی لە ناوچەکەدا ، ئەوا وەرزش وانەکان دابەش بونە بەسەر یانە و گروپە وەرزشیەکانی تایبەت بە حزبەکان واتە هەردوو حزبی باڵا دەست بە ئارەزووی خۆیان دەستیان خستۆتە نێو کاروباری ئیداری یانەکانی کوردستان، بەهەمان شێوەش مامەڵە لەگەڵ تیپە میللەکان دەکەن و ئامادەنینە هاوکاری مادی و مەعنەوی هیچ تیپێکی میللی بکەن بەبێ مەرج !

ئەوەشمان لەیاد نەچێ کە بەداخەوە ئەم جۆرە پەیوەست بونە بە وەرزش هەندێ جار هۆکاری سلبی لێ دەکەوێتەوە ئەویش بێ دەنگ بون و سەرقاڵ کردنی گەنجە لەبەرامبەر کەم و کوڕییەکانی دەسەڵات .

## کۆچ کردن وەك دوا فاکتەر

راستە کۆچ کردن دیاردەیەکی مێژووییە و لە کۆنەوە کۆچ کردن هەبووە ، لەهەمان کاتدا لە بەندەکانی جاڕنامەی مافی مرۆڤدا دەڵێت هەر مرۆڤێك ئازادە لە کوێ دەژی و کوێ دەکاتە نیشتمانی خۆی ، بەڵام دەبی ئەو راستیەش بزانین کە کۆچ

گەرانـە بـەدوای خۆشـی و لەزەتـەکانی ژیـان و مومارەسـە کـردن و هێنانـەدی حـەزو خولیاکان و ژیانێکی ئازاد و خۆشگوزەران ، هەمووشمان لەسەر ئەوە کۆکین کە کۆچ کردن ئاساییە بۆ گەڕان و پشوودان و کات بەسەر بردن ، بەلاّم ئەم شێوە کۆچ کردنە ئاسایی نییە کە تاکەکانی ولاّتێك هەمووی هەر وشەی کۆچی لەسەر زار بێت و کۆچ کردنێکی نا ئاسایی و پڕ لە مەترسی و مەرگ ! ئەمرۆ لەکوردستان بەهـەر گـەنجێك بلّێی هیواو ئاواتت چییە! دەلّێ کۆچ بکەم بۆ ئەوروپا ، هەمووشمان لەوە دلّنیاین کـە ئەورووپاش ئەو بەهەشتە نییە ، بەلاّم چی وای لە ئێمە کردووە نیشتمانی دایکمـان لا ببـێ بـە دۆزەخ ! ئەمـە پێویـستی بـە لێکۆڵینـەوە و ڕێگـا چـارە هەیـە کـە بێگومـان هۆکارەکانی کە پێشوتر باسمان کردووە بەشێکن لەم دیاردەیـە و بەشـەکەی تریـشیان کەمتەرخەمی حکومەت و خراپی ڕەوشی سیاسی ناوچەکەیە ، تا ئەو ڕادەیـەی سـالّی ٢٠٠٧ زۆرتـرین گـەنج ولاّتیـان جێهێـشت و زۆرێکـیش سـنورداش کرانـەوە کـە زیـاتر لە(٥) هەزار بوو ، جگە لەوانەی بە ڕێگای یاسایی و قاچاغ گەیشتونەتە ئەوروپا .

## تێڕوانینێك بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە

توێژی لاوان وەك ئەکتیڤ ترین توێژی نێو کۆمەلّ لە هـەموو کۆمـەلگایـەك شـوێن و کاریگـەری تایبـەتی خۆیـان هەیـە لـە پـەروەردە کـردن و گۆشـکردن بـە هەسـتە نەتەوایەتی و نیشتمانییەکان و هـەموو حکومـەتێك ئـەم ڕاسـتیە دەزانـێ کـە هێـزی جەسـتەیی و فیکـری لاوان کاریگـەرترین هێـزی بـەرگری و داهێنـانن لـە نێوکۆمەلگاکانیاندا ، بۆیە حکومەت ئەرکە لەسـەری بـە هـەموو شـێوەیەك هاوکـاری ئـەم توێـژە بکـات و لـە هەنـدێ کاتـدا ملکەچـی داوا ڕەواکانیـان بێـت ، بـۆ ئـەوەی نەوەیـەکی هۆشـیار و کۆمـەلّێکی تەندروسـت داهـاتووی ولاّتەکـەیان بـەڕێوە ببـات ، ئەمەش مانای ئەوە نییە لە بڕی ئەم خزمەتکردنـە حکومـەت کۆمـەلّێ تـەوق بخاتـە گـەردەنی لاوەکـانی بـۆ ئـەوەی هـەرکاتێ بیـەوێت بـە ئـارەزووی خـۆی سـنوری هەلّسوکەوتیان بۆ دیاری بکات ، چونکە ئەرکی حکومەتە تاکەکانی بپارێزێ و پلان

و بەرنامەی تۆکمەی هەبێت بۆ خۆشگوزەرانی و هێنانەدی خەون و ئامانجەکانیان ، بێگومان هەرکاتێك گەنجەکانیش هەستیان بەوە کرد کە حکومەتەکەی هاوخەمیتی و مافەکانی بۆ دابین کردووە و ڕێگر نییە لەبەردەم ئازادییەکانی، ئەوا گومانی تیانییە ئەو گەنجە زیاتر هەست بە بەرپرسیارێتی خۆی دەکات لە بەرامبەر ئەرك و مافەکانیدا، بەڵام بەداخەوە لە ولاتەکەی ئێمەدا ئەم هاوکێشەیە هەڵاوگێڕ بۆتەوە و تاکەکانی پێش دامەزراندنی حکومەت و دوای حکومەتەکەش تەنیا بەشیان قوربانی دان و برسیەتی و بێڕێزی و بێ مافی بووە ! بێڕێزی و بێ مافی لە بەرامبەر رابردوویان لە تێکۆشان و قوربانی ! لە بەرامبەر هێز و وزەو بیری تازەی دەستکەوتەکانی ئێستایان کە خۆیان خاوەنی هیچ شتێ نین ! چونکە ئەمە بێڕێزیە کاتێ بەرپرسێکی باڵا لە حکومەت یا لە حزب لە شوێنی گوێ گرتن لە خواست وپێشنیاز و داواکاری گەنجان ، بڵێ خەڵکی ئێمە تەمبەڵن و کارناکەن ، گەنجانمان هەستی نەتەوایەتیان لاوازە بۆیە ولات بەجێ دەهێڵن ! لە کاتێکدا هەموو دەستکەوتە نیشتمانی و نەتەوایەتییەکانی ئەمڕۆی کوردستان بەرهەمی خوێن و قوربانی دانی گەنجانە ! لەوەش دڵنیاین کە مانەوە و گەشە پێکردن و پاراستنی ئەم ئەزمونەشمان هەر بە بەرگری و داهێنانەکانی لاوانەوەیە ، نەك ئەو مشەخۆرانەی لە رابردوو لە ئێستاشدا سەر گەرمی پارە کۆکردنەوە و ئیحتکار کردنن !

راستە ئەمڕۆ کار هەیە و بەدەیان پرۆژەی بیناسازی شەڕ لەگەڵ هەورە تریشقە دەکەن ، بەڵام بە گەنج چی کاتێك خۆی خاوەنی بستێ زەوی نەبێ ! خاوەنی داهاتێك نەبێ و بە بەرچاوی خۆی مافەکانی لێ زەوت دەکەن و بە داهاتی ئەو خەڵك دبێتە خاوەنی کۆشك و تەلار و کۆمپانیای دەولی ! ئەمە چ کارکردنێکە کرێکارێك ، فەرمانبەرێك ، مامۆستایەك موچەکەی بەشی کرێی خانووەکەی ناکات ! ئەمە چ زەمانەتێکە حکومەت و کۆمپانیاکان دەیدەن بە هاوڵاتیان و گرێ بەستەکان لە برِی بێ کاری و پەکەوتەو نەخۆشەکان! کوا ئەو کارگە گەورانەی کە حکومەت بە هێز دەکەن و ئێمەش بێ کارناکەن ! کوا ئەو وەزارەتەی بە ناوی کارو کاروباری

کۆمەڵایەتی ، کار بۆ هاوڵاتیان دەدۆزێتەوە یان یارمەتی دارایان دەدات تا کارێك بۆ خۆیان دەدۆزنەوە! لە کاتێکدا ئەم وەزارەتی کارە لە وڵاتاندا بە بایەخترین و پڕ پڕۆژەترین و کاریگەرترین وەزارەتی نێو کۆمەڵگاکەیانن و یارمەتی دارایی هەزاران هاوڵاتی خۆی و بیانی دەدات بەناوی سۆسیالەوە !

بەداخەوە ئەمڕۆ بەبیانوی بازاڕی ئازاد خەریکە کەرتی تایبەت و بازرگانەکان حکومەت ناشرین تر بکەن ، چونکە حکومەت بە ئەرکی خۆی هەڵنەستاوە و ئەم کۆمپانیا و کارگانەی فرۆشراونەتەوە کەرتی تایبەت بە ئارەزووی خۆیان کرێ و سەعاتی کار و دەرکردن و وەرگرتن ئەنجام دەدەن نمونەشمان زۆرە کە سەدان گەنجی کرێکاری کورد لەو شوێنانە دەرکراوە و کرێکاری تورکی و بەنگلادیشی لە شوێنیان کاردەکەن بە موچەیەکی کەمتر لە کاتێکدا ئەمە گەورەترین کۆسپە لەبەردەم بێکاری و (هەڵاوسانی دارایی) چونکە ئەم کرێکارانە مانگانە بڕێکی زۆر پارە لەنێو کوردستان رەوانەی دەرەوە دەکەن ! هەرچەندە ئێستا رێژەیەکی زۆر لەم کرێکارە بیانیانەش دەرکراون و لە شەقامەکان سواڵ دەکەن ! بۆیە گرنگە حکومەت بەخۆی دابچێتەوە و ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکات بەرامبەر هاوڵاتییەکانی بەتایبەتی گەنجەکان ، بۆ ئەوەی هەردوولا تەواو کەری یەکتربن لە راپەڕاندنی ئەرك و فەرمانەکان ! چونکە کاتێك هاوڵاتی نەتوانێ لەرووی جەستەیی و پێداویستەکانی تێر بێ ناتوانێ کەسێکی کاریگەر بێت ، بۆیە ناچارە پەنا بباتە بەر هەندێ کار کە رەنگە خۆشی باوەڕی پێ نەبێ وەك خۆ فریودان بە کاری تیرۆرستی و ماددە هۆشبەرەکان ، بێگومان ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر دوارۆژی کۆمەڵگاکەمان دەبێت بەتایبەتی خۆ خەریك کردن لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکان کە خەریکە دەبێتە دیاردەیەکی زەق ! لەهەمان کاتدا بێ ئومێدی لەلای گەنجەکانمان گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە پەنابەنە بەر خۆکوشتن ! جگە لەوەی رۆژانە چەندین گەنجی کچیش بە بیانوی شەرەف بە شێوەیەکی وەحشیانە دەکوژرێن یان خۆیان دەسوتێنن ! لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە بە درێژایی مێژوو سەیری ژیانی

کۆمەڵایەتی ئافرەتانی کورد بکەین هیچ کاتێك وەك ئێستا ڕێژەی قەیرە کچی بەرز نەبۆتەوە کە ئەمەشیان ئاکامێکی خراپی کۆمەڵایەتی بەدوادادێت ! بۆیە گەنج کە لەم هەموو قەیرانەدا بژیت و هیچ شتێکیشی پێ چارە نەکرێت ناچارە پەنا بباتە بەر کۆچ وەك فریاد ڕەسێك چونکە واهەست دەکات هیچ شتێك ئەو بەو وڵاتەوە نابەستێتەوە کە جگە لەوەی مافەکانی زەوت کردووە ڕێگریشە لەبەردەم ئایندەی!

لەلایەکی ترەوە بەپێی دەستوری عێراق و یاساکانی هەرێمی کوردستان هەرهاوڵاتیەك تەمەنی سی ساڵ کەمتر بێ ناتوانێت خۆی بپاڵێوێت بۆ پۆستەکانی پەرلەمان و ئەنجومەنی پارێزگاکان ! کەچی لاوانی تەمەن(١٨-٢٩) ساڵان دەنگدەدەن ، بەلام هیچ نوێنەرایەتییەکی ئەو توێژە زیندووەی لاوان لە پۆستی یاسادانان لە ئاستی پەرلەمانی عێراق و کوردستان و ئەنجومەنی پارێزگاکان نیەو بگرە لە نێو کابینەکانی حکومەتیشدانیە !

ئەم ڕێگریە یاساییە وایکردوە کە بەشداری سیاسی لاوان لە پێگەکانی یاسادانان و بەڕێوەبردنی وڵات زۆر لاواز بێت . لە کاتێکدا وڵاتی ئێمە زۆر پێویستی بە توانا و لێهاتوویی ئەم توێژەی لاوانە ، دەبێ ئەم ڕاستیەش بزانین جگە لەو هۆکارانەی باسمان کرد خودی گەنجانیش هۆکارن بۆ تەشەنەکردنی گرفتەکان ، چونکە ملکەچی زۆر لە داب و نەریتەکانن ، لە هەمان کاتدا بێ دەنگن لەبەردەم ئەو هەموو ناهەقیە و ماف زەوتکردنەیان لەلایەن نێوەندەکانی حکومی ، بەداخەوە ئەمڕۆ خودی گەنجان ئەوەندەی خۆیان خەریك دەکەن بە کێشەی لاوەکی و کات بەسەر بردن لەسەر شوستەکان! ئەوەندە خۆیان خەریك ناکەن بە خۆ ڕۆشنبیرکردن و تێگەیشتن لە ڕاستییەکان ، لەلایەکی تر خودی گەنجانمان پەرشو بڵاون و لە نێو خۆیاندا کۆك نین لەسەر خاڵە جەوهەریەکان و بە بەڵێ و نەخێری حزبەکان هەنگاو دەنێن .

لەهەمان کاتدا گرنگی دەرچونی یاسایەکی نوێ بۆ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێویستییەکی سەردەمیانەیە، چونکە لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ەوە لە هەرێمی کوردستان بەمەبەستی ڕێکخستنی کاروباری ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای

مەدەنی یاساکانی (١٨)و(١٥) دەرچوون ، ئەو یاسایانە بۆ سەردەمی خۆیان لەبارو گونجاو بوو وەك سەرەتای ڕێکخستنی ژیانی ڕێکخراوەکان ، بەلام لەدوای ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوریانەی کە لە هەرێمی کوردستان و ناوچەکە ڕوویانداوە پێویستی دەرچوونی یاسایەکی هاوچەرخ لە ئارادایەو ، بەم دواییانەش ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ڕەشنووسی یاسایەکیان پێشکەش بە حکومەت و پەرلەمانی هەرێم کردووە ، هەر یاسایەك کە دەردەچێت پێویستیشە کۆمەڵێك بنەما لەخۆ بگرێت کە گرنگترینیان پاراستنی ئازادی ڕێکخراوبوون و گرێدانی کۆڕو کۆبوونەوە و پاراستنی سەربەخۆیی ڕێکخراوەکان و هاوکاریکردنی پرۆژەکانیان و ڕەچاوکردنی پێوەرە نێودەوڵەتییەکانن لەم سۆنگەشەوە دەبێت هەرچی زووە ئەو یاسایە دەربچێت بۆ ئەوەی ژیانی ڕێکخراوەیی لە هەرێمی کوردستاندا لەم دۆخەی ئێستایدا دەرباز بکات کە لەو کاتەی پشتگیری دارایی و مەعنەویی ژمارەیەك ڕێکخراو دەکرێت لەهەمان کاتدا ژمارەیەکی دیکەیان پشتگوێ خراون !

بۆیە گرنگە حکومەت بەخۆی دابچێتەوە و سود لە بەرنامە و پلانی وڵاتانی پێشکەوتوو وەربگرێت و ڕێگا چارە بدۆزێتەوە و گوێ لە ناخ و هەزری لاوان بگرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نیشتەجێ بوون و هاوسەرگیری و بێ کاری و هاوکاری دارایی ...هتد .

# خۆکوشتن دوا وێستگەی ململانێکان

خۆکوشتن بە مانا سادەکەی واتە مردنی کەسێك بە دەستی خۆی کە دەگرێت بڵێین ئەو مرۆڤەش ئەندامێکە لە جەستە گشتییەکەی مرۆڤایەتی، بێگومان مرۆڤی خۆکوژ ئەگەر زەمینەی باشتری بۆ برەخسێ و رۆحی لێبوردەیی لە بەرامبەری هەبێت رەنگە یەکێك بێت لە ئەندامە چالاکەکانی نێو کۆمەڵ، کەواتە خۆکوشتن ئەو کردارە مەترسیدارەیە جگە لە لە دەستدانی خودی خۆکوژەکە، ئەوا خێزانەکەی و کۆمەڵگاکەش بە جۆرێك لە جۆرەکان توشی زەرەر مەندێتی دەبێت.

بەداخەوە ئەم جۆرە کردارە لە کوردستاندا لە پەرەسەندن دایەو خەریکە رۆژانە رۆحی گەنج و لاوەکانمان دەکێشێ!

ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئێمە لە رووە پەروەردەیی و کۆمەڵایەتییەکەی لاوازیەکی زۆرمان هەیەو نەمان توانیوە منداڵەکانمان یا گەنجەکانمان لەسەر ئەو بنەمایە رابهێنین کە ژیان هەمووی ململانێیەو براوەش لەم ململانێیە (خۆڕاگری و دیالۆگ و لێبوردەییە) بۆ لەیەکتر گەیشتن و جوانتر کردنی ژیان!

لە رابردوو ئێستاشماندا هەست بەوە دەکەین کە ئافرەتانمان لەبەر ئەو فشارە کۆمەڵایەتیانەی کە لەلایەن باوك و براکانیان دەخرایە سەریان ناچار پەنایان دەبردە بەر خۆ سوتاندن، بۆ ئەوەی لە مردنی رۆژانە رزگاریان بێت! کەچی ئەمڕۆ جگە لە بەردەوامی ئەم دیاردەیە ئەوا خانمە قوتابیەکانمان پەنا دەبەنە بەر خۆ خنکان و هەڵواسین لە بەر ئەوەی لە ناوەندەکانی خوێندن سەرکەوتوو نەبووە، یان مامۆستاکەی لە بەردەم هاوپۆلەکانی وتەی ناشرینی پێ گوتووە!

ئەم جۆرە کردارە رەگەزی کوڕیشی لێ بێ بەش نییە، لەهەمان کاتدا گەنجە کوڕەکانمان لەبەر شکستی خۆشەویستی و خراپی باری دارایی و زۆری کێشەو گیروگرفتەکان و نەبونی رێگە چارەی گونجاو ئەوانیش پەنا دەبەنە بەر خۆ هەڵواسین و خنکان یا ژەهر خواردن و خۆکوشتن بە چەك ، بۆیە گرنگە دایك و باوکانمان هاوڕێکانمان هەموو دەزگا حکومی و پەروەردەییەکانمان باشتر بیر بکەینەوەو باشتر هاوکاری یەکتربین بۆ پێشگرتن لەم کردارە نا بەجێیە بۆ ئەوەی نەبێتە (دیاردە)یەکی قێزەون، لەوەش گرنگتر ئەوەیە خودی کوڕو کچە گەنجەکانمان باوەڕێکی زیاتریان بە خۆیان هەبێت و لەکاتی کەوتن و شکستهێنانا باوەڕمان بە هەڵسانەوە هەبێت و خۆکوشتن نەکەینە دوا بڕیاری ململانێکان، چونکە ژیانیش بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانییەوە جوانە.

# وڵاتی حزبەکان!

حزب یان باشتر بڵێین پارتی سیاسی ئەو کیانەیە کە بە مەفهومی خۆی کۆمەڵێ کەسی خاوەن یەك بۆچون لە خۆی کۆدەکاتەوە، هەر لەو دەستە جەمعیەش کار بۆ گەشەکردنو پەیڕەوکردنو چەسپاندنو پاراستنی بیروڕاکانیانو بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانیان کاردەکەن! واتە حزب ئامرازێك دەبێت بۆ گەیشتن بەئامانج جا ئامانجەکانیش لە خودی بەرنامەی حزبەکەو پراکتیزەکردنیان بەدەردەکەوێت کە ئایە ئامانجەکان گشتین یان فەردین، لێرەدا نابێت ئەمەشمان لەیاد بچێت کە حزبیش پیرۆزی خۆی هەیەو قوربانی دانیشی گەرەکە بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی! بەلآم ناشکرێت حزب بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانیو چەسپاندنی بیروڕاکانی ببێت بە دەزگای سەرکوتکار یان هەرکاتێك بەرژەوەندییەکانی کەوتە مەترسیەوە گەمە بە چارەنوسی میللەتێکەوە بکات لە پێناوی مانەوەی خۆیدا ! ناکرێت گەل حزبێك بە (فریاد رەس) بزانێ ئەگەر ئەو حزبە دەسەڵات لە خەلك وەرنەگرێت بە شێوەیەکی دیموکراسیانە! وەلەهەمان کاتدا خودی حزبەکەش پەسەندی دیموکراتیەت بکاتو گەشەی پێبدات ، هەر چەندە لە ئەزمونی چەند ساڵەی ئێمەدا دیموکراسیەت بە بیرکردنەوەو مۆدێرنەتی حزبی کوردی واتە شەڕو شار دابەشکردنو گەندەڵیو بەتاڵان بردنی سەروەتو سامانی گەل! بەداخەوە ئەمجارەشیان لە دیموکراسیەتە پۆست مۆدێرنەکەی ئێمەدا بە بیانوی یەك لیستیو یەك دەنگیو یەك هێزی وەك برا کورسیەکان پێش ئەنجامدانی هەڵبژاردن دابەشکرا، ئەمەش بەمانای زیندە بەچاڵ کردنی دیموکراسیەت دێتو لەپێناو

سەرەوەریێتی حزبدا، چونکە حزبی بچوكو دروست کراو هەیە نەیتوانیوە (٥٠٠) واژۆکەی خۆی بۆ پاڵپشتی کیانە سیاسیەکەی کۆمسیۆنی بالای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان کۆبکاتەوە! کەچی بەمەبەستی پاڵپشتی لە بیروراکانی حزبێکی تر بوو بە خاوەن کورسی. ئەمەشیان ئاماژەیە بە دووبارە کردنەوەی (٥٠ بە ٥٠)، بەلام بەشێوەیەکی مۆدێرنانەتر، ئەمەش مردنی دیموکراسیەت رادەگەیەنێ، بەلام خۆدەکرا بۆ رێزگرتن لە ناشتنی ئەم دیموکراسیەتە بانگهێشتی جەماوەرێکی زیاتر بکرایە، بەتایبەتیش نوێنەری رێکخراوەکانی لاوان و قوتابیانو ئافرەتان بۆ بەشداری کردنو خزمەتکردن لەو پرسەیە کە سالێکە! چونکە وەك باسی لێوە دەکرێت ئەم هەڵبژاردنە تەوافقیە تەنیا بۆ سالێکە، ئەی باشە ئەمجارەیان کێ نوێنەری رێکخراوە ناحکومیەکانە! لە کاتێکدا رێکخراو هەیە زیاتر لە پەنجا سالە خزمەتی توێژی لاوانی ئەم ولاتەی کردووە، بەلام چونکە بە سیمای حزب کاری نەکردووە ئەمرۆ پەراوێز خراون، ئەم راستیانەش دلنیامان دەکاتەوە کە هێشتا حزب خاوەن هەموو یاساو رێساکانو سەروەریەکانی ولاتە نەك چینو توێژەکانی گەل.

# بۆچی ڕێکخراوەکان بێدەنگ دەبن!

زۆر جار نوسەرو ڕۆشنبیرانمان باس لەوە دەکەن تا ڕێکخراوە پیشەیی و دیموکراتیەکان سەرچاوەیەکی(مادی) سەربەخۆیان نەبێت ناتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن ، دوور لە فشاری حزبی و بیرتەسکی حزبایەتی ، ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە لە تەمەنی ڕێکخراوەکانی کوردستان بەتایبەتی دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١) هەندێ ڕێکخراو هەنگاوەکانیان تا ئەو سنوورە بووە لەگەڵ بەڵێ و نەخێر و شکست و سەرکەوتنەکانی حزب گەورە بوونە! گەورە بونێك بە جەختی پارمەتییە مادیەکان و چاو سوورکردنەوە و باڵا دەستی حزبەکە ! نەك بە بەرنامە و ستراتیژیەتی ڕێکخراوەکە وە ئەگەر بەرنامەیەکی توکمەش هەبێت و دەیان پرۆژەت ئامادەبێت بەبێ پارمەتی مادی سەرکەوتن بە دەست ناهێنیت ، کەواتە کاری ڕێکخراوەیی بەبێ سەرچاوەی مادی ناتوانێت ڕۆڵی تەواوی خۆی ببینێ ، بەتایبەتی لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتووی وەك ئێمە، دەسەڵاتی کوردی لەسەرەتای پێکهێنانی ئیدارەی (٥٠بە٥٠)و شەڕی نێو خۆو وەك خۆشیان دەڵێن (دوو حکومەتی)و قورخکردنی داهاتی کوردستان بۆ هەر دوو حزبی باڵادەست تا ئێستاشی لەگەڵدابێت ، جگە لە ڕێکخراوەکانی سەربەخۆیان (یەك) دیناریان نەداوە بە ڕێکخراوە دیموکراتی و پیشەییەکانی تری کوردستان! کاتێکیش سەرۆکی حکومەت و وەزیری دارایی و زۆربەی وەزارەتەکانی تر لە ژێر دەسەڵاتی حزبی باڵادەست بێت دەرگا کراوەیە لەبەردەم ڕێکخراوەکانیان ، بۆ پێدانی بودجەی مانگانەی حکومەت و حزب لە جێبەجێکردن و هاوکاری پرۆژەکانیان ! ئەم جۆرە هاوکاریەش بێ بەرهەم نییە

بۆ حزبی باڵادەست ، چونکە ڕێکخراوەکان بەزمانی حزب دەدوێن و دوو جۆرە فۆرمی ئەندامێتیان هەیە! ئەمەش مانای وایە ڕێکخراوەکان بەشێکی زیندوون لە حزب و دەسەڵات، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ئامادەنین باس لە کەم و کوڕییەکانی دەسەڵات بکەن ، رەنگە پاساویشیان بۆ هەبێت گوایە کاتەکە لەبارنییە حکومەتمان ساوایە ! بەڵام کاتێ ڕێکخراوێکی تر یان ڕۆشنبیرێك باس لە کەمتەرخەمی دەسەڵات دەکات بەرامبەر بە خواست و پێداویستییەکانی توێژی لاوان و قوتابیان و ئافرەتان لە وەڵامدا ئەو کارانەمان پێ نیشان دەدەن کە ڕێکخراوی حزبەکەی خۆیان ئەنجامیان داوە ، هەرچەندە ئەمەشیان جۆرێکە لە خزمەتکردن و جێگای دەست خۆشییە، بەڵام ئەوەندە فراوان نییە، لەخەمی گەنجەکانمان کەم بکاتەوە ، جگە لەم راستیانە هەر کاتێ شاندێکی بیانی یان هەر ڕێکخراوێکی (NGO) سەردانی کوردستانی کردبێ بۆ یارمەتی و لێکۆڵینەوە لە بارەی ژیانی لاوان و پێداویستییەکانیان ، ئەوا هەر زوو حکومەتەکانمان باس لە رەفاهیەتی لاوانی کوردستان دەکەن و کار و چالاکییە سنوور دارەکانی ڕێکخراوەکانی خۆیانیان بۆ ریز دەکەن لە سنووری دەفەردکەیان !

لە دواییشدا تاکە ڕێکخراو کە شاندی مێوان ببینێ یان پرۆتۆکۆڵی لەگەڵ مۆر بکات ئەوا ڕێکخراوەکانی سەر بەحزبی دەسەڵاتدارە! لە کاتێکدا دەیان ڕێکخراوی تری دیموکراتی و پیشەیی هەیە لە ساڵانی بەر لە راپەڕین و دوای راپەڕینیش خاوەن هەڵوێستێکی دیارو مێژوویەکی پاکە دوور لە خیانەتی نیشتمانی و نەتەوایەتی و ڕۆڵی باشیان هەبووە لە پرۆسەی ئاشتی و ژیانی دیموکراسیانە لە نێو کۆمەڵگاکەماندا بەڵام بەداخەوە لە لایەن هەردوو حکومەتەوە خراونەتە پەراوێز جگە لەوەی هاوکاریان ناکرێ زۆرجار دەبنە ڕێگریش لەبەردەم کارو چالاکییەکانیان ، بۆیە گرنگە حکومەتەکانمان هەڵوەستەیەك بکەن لەم بارەیەوە لە پێناو بنیادنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی و یەکسانیخوازانە .

# تەزکییە دیکتاتۆرییەت و دۆگمایی حزبە

ئەوەی خوێندومەتەوە یان گوێم لێبووە لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەسەڵات لە وڵاتاندا، بەتایبەتی پەیوەندی دەسەڵات بە خەڵکەوە لە ڕێگای دام و دەزگاو بەڕێوەبەرایەتییەکانی بۆ خزمەتکردن و ڕاپەڕاندنی کاروباری هاووڵاتیانەوە، مەبەستێکی تەسکی سیاسی لە دواوە نییە، بەڵکو مەبەستێکی ئینسانیانەیە بەبێ جیاوازی ڕەگەز و ئایین و نەتەوەو ڕەش و سپی، ئەوان باوەڕیان بەوە هەیە داهاتووی ئەو وڵاتە دەکەوێتەوە ژێر کۆنترۆڵی ئەقڵ و هزری تاکەکانی! بۆیە دەسەڵات لەم وڵاتانە خۆی بە بەرپرس دەزانێت لە خۆشگوزەرانی و پێگەیاندنی تاکێکی تەندروست لە هەموو بوارەکاندا. بۆیە بەشێوەیەکی ئەقڵانی پەروەردەیان دەکەن و مافی ژیانیان دابین دەکەن بەبێ جیاوازی وەك مرۆڤ! بەڵام بە جیاوازی لە ڕووی پسپۆڕی و پلەی خوێندنی ئەو کەسە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت لە بەڕێوەبەرایەتییەکاندا، بەداخەوە لە وڵاتەکەی ئێمە نەك هەر دەسەڵات خۆی بە بەرپرس نازانێت بۆ خۆشگوزەرانی و پێگەیاندنی تاکی کوردی بەڵکو جیاوازییەکی ئێجگار بەرچاویش هەیەو بە چاویلکەیەکی سەوزو زەرد کۆمەڵ دەبینن! تەزکیە یان بڵێم بە حزبی کردن تەقیمە لە شوێنی پسپۆڕێتی و پلەی خوێندنت! بەتایبەتی بۆ دامەزراندنت لە یەکێ لە بەڕێوەبەرایەتییەکان یان فەرمانگەیەك ئەم جۆرە کارانەش گومانی زیاتر دەخاتە دڵمانەوە لە بیر تەسکی و خۆپەرستی و مشەخۆری حزب لە نێو کایەکانی دەسەڵاتدا بۆ کۆنترۆڵکردنی زیاتری دەسەڵات بەشێوەیەکی نایاسایی، ئەگەر نا کەی ڕەوای هەقە کەسێك لە مەخموور و زاخۆ لە ماڵەکەی خۆی دابنیشێ و وەك فەرمانبەرێك دابمەزرێت لەسەر میلاکی ئیدارەی سلێمانی و لە خانەقین و دەربەندیخانیش لەسەر میلاکی ئیدارەی هەولێر! تۆ بڵێی نیشتمانپەروەر و لاوی دڵسۆز و بێکار نەبێت لە سنووری ئیدارەکان، بۆیە خەڵکی

مەخمور لە سلێمانیو گەرمیانیش لە هەولێر! بێگومان نەخێر ئەمەشیان گەمەیەکی تری سیاسی نێوان پارتیو یەکێتیە بە مەبەستی بە جەماوەرکردنیان بۆ هەڵبژاردنی داهاتووی پەرلەمانەکەمان!, بۆ نموونە بە گوێرەی هەواڵێکی هەفتەنامەی (هاووڵاتی ژمارە١٧٣) کەمتر لە ساڵێك دوای رووخانی حزبی بەعس تەنیا لە ئیدارەی هەولێر (٥٠ بۆ٦٠) هەزار کەس و لە ژمارە (٨٠) ی هەفتەنامەی جەماوەریش نوسراوە " لەئیدارەی سلێمانی (٥٧٣٦٠) کەس دامەزرێندراوە! بەڵام ئەم جۆرە دامەزراندنە ئەو وتەیە رەفز دەکاتەوە کە لاوێکی خاوەن بڕوانامە و سوودبەخش بۆ کۆمەڵگاکەمان لە کاتی داواکردنی تەزکیەو مەرجی بە حزبیکردن بە دڵێکی بێگەردەوە ئەڵێ من حزبایەتی ناکەم, بەڵام حەز دەکەم خزمەتی وڵاتەکەم بکەم! لاوانی خۆ راگرو نیشتمانپەروەر لاتان سەیر نەبێت مەرجی تەسکییە هەموو مەرجەکانی تری تۆ رەفز دەکاتەوە! چونکە دەسەڵاتێك بە خوێن و لاشەی لاوان دەست کەوتبێ پێویستی بە خەڵکانی دڵسۆزی ئەو رێبازە هەیە تا بیپارێزن! ئەم دۆگمایەی حزبیش بە نێوی دەسەڵات دەمانخاتە نێو پرس و گومانەوە بۆ تا ئێستا ئێمەی لاو نەمانتوانیوە ئەو تەوقە بشکێنین! تاکەی ئێمەی لاو بێدەنگ دەبین *لە بەرامبەر ئەو هەموو ناعەدالەتیە*, ئایا ئەو بێدەنگییەش جۆرێکە لە هەڵوێست یان زۆربەی توێژەکان کۆپی حزبن! ئەی ئەو گەنجەی ئامادەنییە ببێت بە حزبی تۆ بڵێی پێداویستی ژیان ناچاری نەکات! لە کاتێکدا بە دەیان دروشمی بریقەدار بەرز دەکەیتەوە ئەی حزب! تۆ لات وایە ئەقڵ و هزری ئەو کەسەت تەنیا بە تەزکییەك کری و کردت بە دەروێشێکی تر! من مەبەستم ئەوەنییە حزب رەفز بکەمەوە! بەڵام ناشکرێ دەسەڵات بە ناوی حزب قسە بکات و حزبیش دەسەڵات بکاتە وەسیلەیەك بۆ قەڵەوکردنی حزب! چونکە لە وڵاتە دیموکراتییەکان حزب زۆر بچووکترە لە حکومەت! بەڵام بە پێچەوانەوە لە تەزکیەستانەکەی ئێمە حزب لە سەرووی هەموو یاساو بەهاکانە!

# بەرپرسیارێتی تاك لە هەڵبژاردنەکاندا

هەڵبژاردن پرۆسەیەکە لەڕووی یاساییەوە بە یەکەمین شێوە دەناسرێت بۆ گەیشتن بە دەسەلات یان ئاڵ و گۆڕ لە دەسەلات دوور لە بەکارهێنانی هێزی چەکداری و کودەتاو شەڕ یان دەسەلاتی پاشایەتی! چونکە هەڵبژاردن بە رۆح و جەوهەری دیموکراسیەت لە قەڵەم دەدرێ، واتە هەڵبژاردن بەبێ پەیڕەوکردنی دیموکراتیەت هیچ مانایەکی نابێ! چونکە دیموکراسیەت بە مانای (گەل و دەسەلات) دێت واتە ئەو دەسەلاتەی کە پێك دێت دەبێت حکومەتی گەل بێت و بە هۆی گەل دامەزرابێت و لە پێناوی گەل بێت، ئەمەش مانای وانیە ئەگەر لە ولاتێك هەڵبژاردن ئەنجامدرا واتە ئەو ولاتە سەدا سەد دیموکراتیەتی پەیڕەو کردوە. راستە ئازادی هەڵبژاردن بەندە بە دیموکراتیەتەوە، بەلام زۆرجار هەیە (بەرنامەو پاڵێوراوی) سەرنەکەوتوی حزبێك باشترە لە (بەرنامەو پاڵێوراوی) حزبی براوە، کەچی بەحوکمی زۆرینەی دەنگ دەچێتە حوکم و دەبێت بە کورسی گر، ئەمەش خاڵێکی لاوازی دیموکراسیەتە لەڕووی هەڵبژاردنەوە. ئەم دیاردەیەش بەتایبەتی لەو ولاتانە روو دەدات کە ئاستی هۆشیاریان کەمەو تاکەکانی هەست بە بەرپرسیارێتی (خود) ناکەن و بێدەنگن لە ئاست کێشەو کەم و کوڕیەکانی دەسەلات و گرنگی پرۆسەی هەڵبژاردن نازانن! بێگومان لە هەر ولاتێك تاکەکانی هۆشیاربێت و هەڵبژاردن بەمافێکی گشتی خۆی بزانێت، ئەوا پاڵێوراوو بەرنامەی راست و دروست هەڵدەبژێرێت و ئامادەنییە دەنگی خۆی بفرۆشێت و خۆشگوزەرانی تەنیا بۆ خۆی بوێ، بەڵکو ئەو دەزانێت خۆشگوزەرانی ئەویش بەندە بە تاکەکانی تری ناو کۆمەڵگاکەیەوە! هەرکاتێکیش

دەسـەڵاتی هەڵبـژێردراو ئـەو بەرنامەیـەی کـە پـێش هەڵبـژاردنی پڕوپاگەنـدەی بـۆ دەکردو پەیڕەوی نەکرد دوای براومیی لە نێو کۆمەڵگاکـەی ئەوتاکـە هۆشـیارە بـەبێ دوو دڵـیو بـیر تەسـکی دێتـە سـەر شـەقامو دەسـەڵات ملکـەچ دەکـەن نـەك خۆیـان، ئەمەش نیشانەی کۆنترۆڵو چاودێری خەڵکە بەسەر سیستەمە سیاسییەکان، چونکە دەسـەڵاتی سیاسـی هەمیـشە لـە خەڵکـەوە سەرچـاوە دەگرێـتو ئـەبێ ملکەچـی جەماوەربێت، بۆیە گرنگە لە پرۆسەی هەڵبژاردنـەکانی داهاتوی کوردسـتان (تـاك) زیـاتر هەسـت بـە بەرپرسـیارێتی خـۆی بکـاتو سـوود لـە رابـردوو وەربگرێـتو بـە هۆشـیارانەوەو دوور لــە بـیر تەسـکی بەرنامــەو پاڵێوراوێـك هەڵبـژێرێت کـە کەسایەتییەکی نیشتمانیو نەتەوایەتییەو دەتوانێت لە ئێشو ئازاری کـەم بکاتـەوە، دەبێ دەسـەڵاتی داهـاتوو حزبـەکانیش ئـەم راسـتیانە بـزانن نـەك پـێش ئەنجامـدانی پرۆسەکە لێمان بـبن بـە (فریـاد رەس)و رێکخـراوی کـەلو پـەلو پـارە بەخـشینەوە، بـەڵکو دەبـێ پێـشبڕکێکە لەسـەر ئـەوەبێت کامـە (کیـانی سیاسـی) بەرنامەیـەکی تۆکمەتری ئامادەکردووە کە تەعبیر لە زۆرینەی چینو توێـژەکانی کۆمەڵگاکـە بکـات لەرووی چینایەتیو نیشتمانیو نەتەوەایەتییەوە.

# بۆ ئەوەی ئامانجەکانی هەڵبژاردن بێنەدی

هەڵبژاردن لای خەڵکانێکی وەك ئێمە کە هیچ تاقیکردنەوەیەکمان لەسەری نیە چ وەك ماف یاخود ئەرك کردارێکی گران و پڕ گرفتە ، بەتایبەتی دەنگدەران کە هیچ شارەزاییەکیان لەمبارەویەوە نیە یا بڵێین نازانن شارەوانی ئەرك و ئامانجی چیە ! بۆئەوەی دەنگ بدەن و تێکەڵ بەم جۆرە پرۆسانە بن کە یەکێکە لەهەنگاوە هەرە گرنگ و سەرەتاییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کە ئەمرۆ بۆتە دروشمی زۆربەی حزب و رێکخراوێکی لەو پەڕی چەپ بۆ ئەو پەڕی راست ، زەمینە رەخساندن بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان یاخود شارەوانیەکان ، بەنسبەت ئێمەی کورد بەدرێژایی مێژوو شتێکی مەحاڵ بووە ، لە مێژووی گەلی عێراقیش ئەم پرۆسەی هەڵبژاردنە بەشێوەیەکی یاسایی ئەنجام نەدراوە یاگەر ئەنجامیش درابێ بەر لە هەڵبژاردنەکە هەموو ئەنجامەکانی دیاری کراوە ، واتە تەنیا هەڵبژاردنێکی کارتۆنی بووە ، بەتایبەتیش لەدوای هاتنە سەر حوکمی دەسەڵاتی رژێمی فاشی بەعس ، هەڵبژاردنی پەرلەمان و حکومەت و کورسی سەرۆکایەتی دەوڵەتی مەحاڵ بووە بکەوێتە دەستی حزبێکی تر یا هەر گروپێکی تر ، بۆ هەڵبژاردنی شارەوانیش لە مێژووی هەموو عێراق تەنیا جارێك ئەنجام دراوە ئەویش لەسەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی داوو بۆیە پێم وایە پرۆسەی هەڵبژاردن بەگشتی و هەڵبژاردنی شارەوانی بەتایبەتی بۆ ئێمەی کورد ئەو کلیلە ونبوویە کە بەدوایدا گەڕاوین ! ئەنجامدانی هەڵبژاردنی شارەوانی دۆزینەوەی ئەو کلیلەیە کە چەندین ساڵە لێمان وون بووە و کە عەوداڵی دۆزینەوەین بۆ ئەوەی دەرگای ئەو ژورەی پێ بکەینەوە کە دەتوانین تیایدا فێری ئەوە بین چۆن شارێك یا شارۆچکەیەك لە حوکم و جۆری بەڕێوەبردنی

خزمەتگوزاری لەلایەن دەسەڵاتی گەڵ هاوڵاتیانی ئەوشارە دەبێ ، دۆزینـەوەی کلیلـە راستەقینەکەی ئەو دەرگایەو کردنەوەی بەشێوەیەکی هێمنانەو نەشکاندنی دەرگاکە و لەبـەر یـەك نەترازانـدنی چوارچـێوەی ئـەو دەرگایـە ئـەوەمان پێـدەڵێ کـە کـورد گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی بیسەلمێنێ ئاستی هۆشیاری بـەرزەو دەتوانـێ وەك دەوڵـەتانی تـری پێـشکەوتوو دیموکراسیانە بـژی ، کەواتـە ئـەو کاتـەش دەتـوانین وەك عـەرەب گوتـەنی بڵـێین کـورد توانیویـەتی (کەسـی شـیاو لـە شـوێنی شـیاو دابنـێ) گـەر ئـەم رێسایەش جێبەجێ کرا ئەوا ئەو کاتە هەموو تاکێکی کۆمەڵ گەر ژیانی بەرەو باشتر بچێ بـۆ هەڵبژاردنـەکانی داهـاتوو بـە گـوڕ و تینێکـی تـر بـەرەو سـندوقی دەنگـدان دەچـێ و ئـەو کاتـەش کێبڕکـێ دروسـت دەبـێ لـە نێـوان پاڵێوراوەکـان و بەرنامـەی پوختتر دادەڕێژن بۆ ئەوەی بگەن بەشێوێنی مەبەست ، جاکەواتە کـێ بـەرکێ کـردن لەسـەر بنـەماکانی دیموکراسـیانە بەتایبـەتی لـە دەوڵەتێکـدا کـە مـافی تـاك تێیـدا پارێزراو بێ و لەرووی ئابووریشەوە وڵاتێکی سەرکەوتوو بێ ئەوا جێگـای دڵخۆشـییە بەهەند هەڵنەگرتنی دەنگدەرانیش وەك ئەوەی لە هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی ئـەمریکا ئەمـساڵ بینیمـان لـە نێـوان (W- بـۆش و رکابەرەکـەی) نیـشان دەدات کەخـەڵك هەڵبـژاردنیان پـێ کـەم نییـە ، بـەڵکو ئـەوان گەیـشتونەتە ئـەو بروایـەی کـە هـەر یەکێکیان بێنە سەر حوکم گرنگ نییە چونکە ئـەوان مافیـان پـارێزراوە ، واتـە هـەم خۆیـــان ئەرکـــەکانی خۆیـــان پـــەیڕەو دەکـــەن هـــەم وەك تـــاکێکی کۆمـــەڵ داواکارییەکانیشیان جێبەجێ دەکرێ یان بڵێین پـارێزراوە و سیاسـەتێکیان داڕشـتووە لە پێناو پاراستنی کیانی نیشتمانیان و خزمەت کردن بـە هاولاتیـانی خۆیـان ، بـەڵام ئـەم شـتانەی باسـم کـرد لـە کوردسـتانی ئێمـە تائێـستا مانایـان نییـە بـەڵکو تـەنیا خـەیاڵێکی دوورن ، ئەگـەر رۆژێـك هـەرێ تاکێـك گەیـشتە ئـەو بـاوەڕی کەهـەموو مافـەکانی پـارێزراوە ئـەوە گـەر نـەچێتە دەنگـدانیش ئاسـاییە ، بـەڵام بـۆ ئێـستامان گرنگە بەرەو سندوقی دەنگدان بچین . بۆئەوەی ئێمەش بتوانین داوای مافی خۆمـان بکەین و مافیشمان پارێزراو بێ و ئەرکەکانی خۆشمان جێبەجێ بکەین.

# بۆ ئەوەی باشتر لە دیموکراسییەت بگەین

وەك زۆربـەمان لامـان روونـە کـەوا ووشـەی دیموکراسـییەت لـە بنەرەتـدا وشـەیەکی یۆنانییەو بەمانای (دەسەڵاتی میللەت)دێ, یان بـە مانـای (حکومـەتی میللـەت)دێ یـا بڵێن (حوکمێکە یـان دەسـەڵاتێکە پیویـستە بـۆ گـەل بـێ) بێگومـان دیموکراتیـەتیش لەنێو هەر ووڵات و میللەتێك دا بە جۆرێك پەیڕەو دەکرێ کەبێ کەم و کوڕی نیە تا ئێستاش دیموکراسییەت بەمانا گشتییەکەیەوە لـە هـیچ وڵاتێکـدا پـەیڕەو نـەکراوە ، دیموکراسـییەت وەك چـەمکێك لـەهزری کەسـە چـەپ و سۆسیالیـستە پێشکەوتوخوازەکان گرنگییەکی رۆژانەی مرۆڤە. بۆیە لە هەموو ولاتێکدا کار دەکەن لە پێناوی پتەوکردنی بنەماکانی دیموکراسی و پەیڕەو کردنی دیموکراسییەت لە نێو کۆمەڵدا بە تایبەتیش دەسەڵاتی حکومی و بڕیاری پەرلەمان تا دەگاتـە هـەر تـاکێکی کۆمەڵ و کۆمەڵگا .

دیموکراسییەتیش لە سوڵتەی سیاسی دوو رووی جیای هەیـە یـا بڵـێین بـۆی دروست دەبـێ و پێـشکەوتوخوازو چـەپەکانیش پـەنا دەبەنـە بـەر پـەیڕەوکردنی رووە ئیجابیەکـەی نـەك سـلبیەکەی ، لەهـەمان کاتـدا زۆر لـە بیرمەنـدەکان پێیـان وایـە دیموکراسییەت زۆر لە کێشەکان چارەسـەر دەکـات ، بـەڵام کێـشەی تـری بـەدوا دادێ, واتە هەندێ گرفت چارەسەر دەکات و هەندێکیش دروست دەکاتەوە . وەك ئەوەی لە هەڵبژاردندا هێـزو پـارەو دەسـەڵات و زۆرینـە زاڵ دەبـێ بەسـەر نوخبـە, لـە کاتێکدا نوخبە کە هەم لە رووی فیکرەوە هەم لە رووی خزمەتکردنەوە دەتوانـێ دەوری بـاڵا ببینێ بۆ پێشخستنی کۆمەڵ ، لەلایەکی تر ئـەو دروشمانـەی بـەرز دەکرێـت لەلایـەن دەسـەڵاتەوە جێبـەجێ نـاکرێ ، بۆیـە لێـرەدا تێگەیـشتن لـە دیموکراتییـەت کـە

سیستەمێکە بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات، پێویستی بە رۆشنبیری و خۆ رۆشنبیر کردنی هەموو تاکێکی کۆمەڵە چ ئەوانەی لە نێو حزبی سیاسیدا کاردەکەن چ ئەوانەی بێ لایەنن لە گۆڕەپانەکەدا ، بۆیە لێرەدا دەتوانم بڵێم دیموکراتییەت لە سیستەمی سیاسی دا باشترین کار پێکردنی ئەوەیە کە دەتوانێ لە رێگای دەنگدانی گشتییەوە گۆڕانکاری دروست بکات ، کەواتە دیموکراتییەتی سیاسی ئەوەمان پێ دەڵێ کە لە رێگەی هەڵبژاردنەوە خەڵکی ئازادانە دەتوانن دەنگ بدەن بە هەر کیانێک کەمەبەستیانە ئەمەش بۆ بەرەو پێشەوە بردنی شارەکەیان یاخود وڵاتەکەیان، تاك بەئارەزوی خۆی دەتوانێ دەنگ بدات بۆ ئەوەی حکومەتێك پێك بێ کەمافەکانی ئەو دەستەبەر بکات یاخود هەر هیچ نەبێ پارێزراو بێ ، بۆیە دیموکراسییەت رێگا چارەیەکی زۆر گونجاوە بۆ هەڵبژاردنی سەرووتر چ لە حزب یان لەنێو سوڵتەی دەوڵەتدا ، هەر بۆ ئەم مەبەستەش زۆربەی بیرمەندەکان گەیشتونەتە ئەم باوەڕەی کە تەنیا لە سیستەمی دیموکراتی لێك تێگەیشتنێکی تەواوهەیە لە نێوان کۆمەڵ و سیاسەت و حوکمدا بۆ ئەوەی ئاگاداری هەڵەکانبین ، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە بە هۆشیاری مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم چەمکەدا بە تایبەتی لە رووی هەڵبژاردنە گشتییەکان و بیروڕای جیادا دوورمان دەخاتەوە لە مەترسی شەڕو دیکتاتۆریەت ، چونکە ئەو کاتە تاکەکانی کۆمەڵ دەتوانن دەوڵەتێك یا دەسەڵاتێك لە رووی حوکمەوە بگۆڕن لە سلبیەوە بۆ ئیجابی لە پێناو بەرەو پێشەوە چوونی شارێك یا وڵاتێك و زامن کردن و پاراستنی ماف و ئەرکی هەموو هاوڵاتییەك ، دەبێ هەموو تاکێکی کۆمەڵیش بە ئەمانەتەوە مامەڵە لەگەڵ جۆری دەنگدان و ئەو دروشمانە بکات کە حزبێك یاخود کەسێك هەڵیگرتووە بۆ ئەوەی

لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە دەنگی بدرێتێ چونکە ئەوە مانای وا نییە تۆ دەسەڵاتێکی خراپت گۆڕی و دەسەڵاتێکی باشترت هێنایە ئاراوە ، بەڵکو دەبێ جەماوەر هەنگاو لەگەڵ کارو کردەوەکانی ئەم حزبە بنێت کە دەنگیان بۆی داوە و چاوەڕێی کاتی دیاری کراوی هەڵبژاردنی داهاتوو نەکاتەوە ، بەڵکو هەر کارێکی

نارێك و نابەجێیان لێ بینی یاخود ئەو بەڵێنانەی بەر لە هەڵبژاردن دابوویان جێبەجێیان نەکرد ، ئەوا بتوانن رەخنەیان ئاراستە بکەن و متمانەی خۆیان لێ وەرگرنەوە ئەویش بە فشار خستنە سەری و لادانی لەم شوێنەبۆیە گرنگە بەر لە هەڵبژاردن هۆشیارانە بیر بکەینەوە و متمانەی خۆمان بدەین بە نوێنەری راستەقینە کە بێ جیاوازی بیرو باوەڕ خزمەت بەخەڵك بکات لەسەر بناغەی مرۆڤایەتی نەك قالبی سیاسی چونکە ئامانجی هەر هەڵبژاردنێك بەپلەی یەکەم خزمەت کردنێکی بێ لایەنانەیە ! وەك (رێبین هەردی)نوسەریش دەڵێ: (دیموکراسی ئەو کاتە دەست پێناکات کە دەسەڵاتدارێکی دڵفراوان و لێبوردوو دێت و پێمان دەڵێ فەرموو قسە بکە ، من ناتکوژم بەڵکو ئەو کاتە دەست پێدەکات کە کۆمەڵگا دەبینێ دەسەڵاتدار هەڵەیە و تاوان دەکات پێی دەڵێ فەرموو وەرە خوارەوە یان لە بڕیارەکەت پەشیمان بەرەوە ) .

چونکە پتەوکردن و پەیڕەوکردنی بنەماکانی دیموکراسی و هەڵبژاردنی ئازادانە هەنگاو نانە بۆ بە مەدەنی کردنی کۆمەڵگای کوردەواریمان .

# رۆڵی تاکی هۆشیار لە بنیادنانی کۆمەڵگە

بەکەسانێك دەوترێت رۆشنبیر کە بەشێوەیەکی ئەقلانییەت دەروانێتە ژیان و زۆر وردتر و سەرنج راکێش تر لە پێکهاتەی مرۆڤ و خواستەکانیان دەگەن! بەو مانایەی کە ئەو کەسانە تێڕوانینیان بۆ مرۆڤایەتی جوانترو گەورە ترە! هەرئەم تێڕوانینەش جیایان دەکاتەوە بەکاروکردەوە و نوسینەکانیان لە مرۆڤەکانی تر ، نەك جەستەی رەش و سپی ! چونکە دەوڵەمەندی بە(ئەقڵ) زۆر مەزنترو بەناوبانگ ترە لە دەوڵەمەندی مرۆڤ بەسەرمایە، بۆ سەلماندی ئەم راستیەش رەنگە زۆربەمان رۆشنبیر و بیرمەندێکی (عەرەب ،فارس،تورك،رووس،...هتد) بناسین و سەرسام بین بەزانست و زانیاری و ووتەکانیان ، بەلام زەحمەتە سەرمایەدارێکی ئەو نەتەوانە بناسین و خۆشمان بوێت ! لەکاتێکدا زۆربەی بیرمەند و فەیلەسوفەکان تامردنیش بەگیرفانی خاڵی ژیاون ، کەچی مەزنترین سەرمایەیان بۆ خۆیان و مرۆڤایەتی کۆکردۆتەوە ئەویش تێڕوانینە مەعریفەییەکانیانە بۆ ژیان و گۆڕان کاریەکان ! ئەگەر سەیرێکی ژیان و گەشەی ئەو بیرمەندانە بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە جگە لەو هەموو زەحمەتە و کۆڵە مەرگیەی ژیانیان خۆراگری و خۆ پەروەردەکرنی بەردەوام بۆتە هۆی بنیادنانی ئەم کەسایەتیەیان نەك خۆ فرۆشتن و پارە کۆکردنەوە بەشێوەیەکی نایاسای ! ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ تەنیا بەکۆشش کردن و خۆ پەروەردەکرن و خوێندنەوەی بەردەوامی زانستە فیکری و مەعریفەییەکان دەتوانێت ببێت بەکەسێکی ئەکتیف ! واتە ئەوانەی زیاتر سەرقاڵی خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەن لەبەرامبەر دەستور و یاساو رێساکانی کۆمەڵ و کۆمەڵگا دەتوانن رزگاربن لە کۆڵە مەرگی ، نەك ئەوکەسانەی لایان وایە ژیان واتە کۆیلەی و بێ

دەنگی و خوا پێداو خوا پێنەداو ، چونك بەدرێژای مێژوو خۆشگوزەرانی و ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی پەیوەست بووە بەژیان و تێکۆشانی چین و توێژەکان و ستەمی ئەو وڵاتە ! لەهەر کۆمەڵگایەك تاکەکانی رۆشنبیرو هۆشیار بن هەم خۆیان هەم دەسەڵاتیش دورە پەرێز دەبێت لە نایەکسانی و گەندەڵی ! بەو مانایە هەرکاتێ میللەت هۆشیار بێت ئەوکاتە (تاك) دەبێتە (رەقیب) چاودێر بەسەر دەسەڵاتەوە بۆ خۆشگوزەرانی ! دەبێ ئەو راستیەش بزانین هەموو دەسەڵاتێکی دونیا ئەوەندەی لە رۆشنبیرێکی قەڵەم بەدەست و نەوەیەکی رۆشنبیر و هۆشیار دەترسێت ! ئەوەندە لە سوپایەکی پڕ چەك و جبەخانە ناترسێت ! بۆیە هۆشیاری و رۆشنبیری تاکەکان وەك چرایەك وایە بۆ رۆشن کردنەوەی ژوورە تاریکەکان و دۆزینەوەی رێگای راست و دروست بۆ رزگاری نیشتمانی و نەتەوایەتی و دوا کەوتن و بنیادنانی کۆمەڵگایەکی مۆدێرنەت ، لەسەر بنەمای بەیەکەوە ژیان و ژیان بۆ هەمووان ! بۆیە گەردەتەوێ ژیانت باشتر بێت و کاریگەریت هەبێت لە ناوەندەکانی دەسەڵات کتێب بکە بە نزیکترین هاورێت !

# پەیڤێك بۆ رۆژی لاوانی جیهان

رێکەوتی ٨/١٢ وەك رۆژێکی تایبەت بە جەژن و شادی بۆ توێژی لاوانی جیهان ناسراوە و ئەوە چەند ساڵێکە لە ئاستی وڵاتاندا لەم رۆژەدا رێکخراوەکانی لاوان و گەنجان بە هاوکاری وەزارەتەکانی پەیوەندیدارو رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی هەڵدەستن بە ئەنجامدانی دەیان چالاکی و پێشبڕکێی جۆراوجۆر، بۆ بەدەرخستنی تواناکانی لاوان و ناساندنی ئەم رۆژە وەك رۆژێکی تایبەت لە ژیانی لاوانی جیهان !

هەرچەندە ئەم یادەش لە کوردستانی خۆشەویستمان بە هاوکاری وەزارەتی وەرزش ولاوان و رێکخراوەکانی تایبەت بە لاوان و رێکخراوە(NGO)یەکان خەریکە دەبێتە نەریتێك و چەند ساڵێکە بۆ بەرزڕاگرتنی ئەم رۆژە چەندین ئاهەنگ و فیستڤاڵی هونەری و رۆشنبیری ئەنجامدەدرێت کە ئەوە جێگای ستایش و رێزە بۆ وەزارەت و رێکخراوەکانی بەشدار بووی ئەم چالاکییانە!

بەڵام لەهەمان کاتدا جێگای رەخنەو تێبینییە بۆ خودی وەزارەتەکانی تایبەت بەلاوان و (NGO)کان کە تەنیا کاریان رازاندنەوەی ئەم رۆژە بێت و پەنجە نەخەنە سەر ئەو هەموو کێشەو گیروگرفتە گەورانەی کە خەریکە تەمەنی لاوێتی هەزاران لاوو گەنجی ئەم وڵاتە لە ناعەدالەتی و بێکاری و کەمی دەرامەت و کەمی هاوسەرگیری و نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون و دەیان و سەدان کێشە و گیرفتی ترکە ژیانیان دەهاڕێ! کەچی ئەم حکومەتە ماوەی(١٨) ساڵە نەیتوانیوە چارەسەری ئەم گرفتانە بکات و کەمێك لە ئاست بەرپرسیارێتی خۆی دابێت !

لەکاتێکدا لە هەموو وڵاتانی دونیادا ئەوەندەی حکومەتەکانیان بە دوای خۆشگوزەرانی و چارەسەرکردنی گرفتەکانی هاوڵاتیانی خۆیانن ئەوەندە بە تەنگ کۆکردنەوەی سامان و داهاتی نایاسایی دروستکردنی کۆشك و تەلار و کۆمپانیای

تایبەت و وەهمی نین ! بەڵکو داهاتی وڵات لە خۆشگوزەرانی وباشترکردنی ژیانی هاوڵاتیانیان سەرف دەکەن کە ئەوە پەیامی راستەقینەی حکومەتە نەك کۆکردنەوەی سەروەت و سامانی هاوڵاتیان بۆ گیرفانی حزب و رابواردنی شەوە پەمەییەکانی کوڕە مەسئول و دەڵاڵەکانیان و کرین و دامەزراندنی سەدان کۆمپانیای خەیاڵی لە ئەوروپا !

سەرەڕای ئەو هەموو کێشەو گرفتەی کە هەموو لایەکمان هەستی پێدەکەین و زۆرجاریش لە ئاستی هەڵوێست و بەرگری کردندا لاوازین ! بۆیە پێویستە حکومەت بە ئەرکی خۆی بزانێت کە داهاتوی ئەم وڵاتە دەکەوێتە ژێر کاریگەر و تواناکانی ئەم گەنجانە ! بۆیە درێغی کردن لە پێداویستیەکانی لاوان جگە لە توندو تیژی و بێ ئومێدی تاکەکان بەرامبەر بە حکومەت هیچی تر بەرهەم ناهێنێت .

## سەرکردەکان ..!
## ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بڵێن بمانبوورن !؟

دوای چەند مانگێك لە سەرهەڵدانی کێشەی کچە شۆخی ئەمریکی (مۆنیکا لوسکی) لەگەڵ سەرۆکی پێشوی ئەمریکا(بیل کلنتۆن)و نکۆڵی کردنی سەرۆك (کلنتۆن) لە دمیان ووتار و لێدوان کە هیچ پەیوەندییەکی سێکسی ناشەرعی لەگەڵ کچە شۆخ(مۆنیکا) نەبووە ، بەڵام کاتێ کە کراسەکەی خاتوو (مۆنیکا) بەرەو هۆڵی تاقیگە چوو بۆ پشکنینی شوێنەواری رابواردنەکەی نێوانیان، (کلنتۆن) کێچی کەوتە کەوڵ و زانی ریسەکەی لێبۆتەوە بە خوری و درۆ گەورەکانی لێ ئاشکرا ئەبێ ، چونکە پێشوتر ئەی ووت ئەم قسانەی(مۆنیکا) هەڵ بەستراوە و شانۆگەریەکی سیاسیە بۆ ئەوەی لە کەسایەتی من کەم کەنەوە ، بەڵام هیچ کام لە قسەکانی سەری نەگرت ، ناچار دانی بەکردارەکەی خۆی داناو زۆر بێ شەرمانە لەبەردەم دەزگاکانی راگەیاندنی جیهانی ووتی : بەڵێ من پەیوەندی سێکسیم لەگەڵ خاتوو "مۆنیکا" هەبووە و بەهەڵەدا چووم و زۆریش پەشیمانم، بۆیە (داوای لێبوردن لەگەلەکەم و خێزانەکەم دەکەم) ئەمە دەقی قسەی سەرۆکی ئەمریکا بوو . ئەی باشە ئەمە ئابرۆ چونێکی گەورە نەبوو بۆ سەرۆکی یەکێ لە گەورەترین وولاتانی سەرمایەداری ئێستای جیهان ، نەك بۆ ئەوەی کە لەگەڵ ئافرەتێك مومارەسەی سێکسی کردووە ، بەڵکو بۆ ئەوەی کە درۆی لەگەڵ گەلەکەی کردووە . ئەی بۆچی بۆ میللەتێکی وەکو ئێمەی هەژارو مالوێران شورەیی بێ گەر سەرکردەکانمان بڵێن ئێمە هەڵە بووین و بمانبورن لەکاتێکدا خەڵکی ئەمریکی زۆر لەئێمە پێشکەوتوترن و خاوەن دەوڵەتی خۆیانن و ئەم دان پێدانانەی (کلنتۆن) یان قەبوڵ کردو بەشتێکی زۆر بچوکیان

داناو لە پلەو پایەشیان لانەدا. کەچی ئێمەی لەچاو ئەواندا دواکەوتوو، لەگەڵ نەبوونی کیانێکی سەربەخۆ بۆ دەبێ جورئەت نەبێ دان بەم راستیە دابنێین ، یان ئەوەتا شەڕی نێو خۆ و خۆخواردن پیشەمانە و تاکە جەمسەری سەرەکیە بۆ وەدەست هێنانی دەسەلاتی تاك رەوی و بەناو دیموکراسیش ، ئەی گەر وانیە بۆچی سەردارانمان تا ئێستا کە زیاتر لە (٣٠)ی ساڵە بەو شەڕەیان ماڵوێرانی بۆ کورد و کوردستان و ناو زراندن و ئابرۆ چوونیان داوەتە پاڵ میللەتەکەمان و نەیان توانیوە بڵێن بەڵێ ئێمە قەرزارباری نەتەوەکەمانین ، کەچەندین ساڵ لەژێر دەسەلاتی رژێمە یەك لەدوای یەکەکان چەوساونەتەوە ئێمەش ئەمرۆ بەم شەڕە ناوخۆییە بەسیاسەتێکی چەوت و چەوتانەتر ئەیان چەوسێنینەوە؟

دەبێ برا سەرکردەکانمان باش بزانن ئێمە هێشتا قۆناغی رزگاری نیشتمانیمان لەپێش ماوە، مومارەسەی دیموکراسیش پێویستی بەکرداری عەمەلی هەیە نەك تەنیا بەزار . بۆ ئەم کاتەمان و لەپێناو پاراستنی ئەزمونەکەمان خۆئامادەکردن لە پێناو رزگاری نیشتمانی پێویستمان بەتەواوی هێزی حزبی و چین و توێژێك دەبێ ، پێویستە لەخۆ بورد و چاو نەترس بین لەبەرامبەر رەخنە لێگرتن و رەخنەگرتن بۆ ئەوەی کوردستانەکەشمان وولاتێکی نمونەیی بێ لە فرە حزبی و قبولکردنی بیروڕای ئازاد و جیا . پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە سەرکردەکانی شەڕ ئێوەش بڵێن داوای لێبوردن لە میللەتەکەمان دەکەین ، نەك تەنیا بەقسە بەڵکو بەکردار .

# ڕۆژنامەگەری پەیامی نوێخوازانە

سالانێکی زۆرە لە کوردستانیش وەك ولاتانی پێشکەوتوو دیموکراتخواز بانگەشەی ئەوە دەکرێت ڕاگەیاندن دەسەلاتی چوارەمە ، بۆ بنیادنانی کۆمەلگایەکی تەندروست و ئازاد و یەکسانی خوازانە! بەلام ئەو ڕاستیەمان لەبیر نەچێت ئەم دەسەلاتە دەسەلاتی کورسیگر و مۆنیکاو ڤێلاو کۆمپانیا نیە ! بەلکو دەسەلاتێکی گەرۆکی بێ هەوارە و هاوخەم و هاودەردی هەژاران و چەوساوانە ! بۆیە ئەم شەرەفەی پێ بەخشراوە بەبێ هەلبژاردن و تەوافق و خروقات ! ڕۆژنامەگەری بەشێکی هەرە زیندووی بواری ڕاگەیاندنە ، لەهەر ولاتێك ڕۆژنامە بونی هەبێت بە تایبەتیش ڕۆژنامەی ئازاد ئەوە گومانی تیانیە کاربەدەستانی ئەم ولاتە ناتوانن گەمە بە چارەنووسی میللەت و کایەکانی دەولەتەوە بکەن ! چونکە ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسی ئازاد هەموو کات ڕەقیبە بەسەر دەسەلاتەوە ، لە کوێ گەندەلی و مەترسی و بۆشایی هەبێت ئەو لەوێدا بونی هەیە ! لە ولاتەکەی لەمەڕ خۆشمان (٢٢)ی نیسانی ئەم سال (١٠٧) سال تێدەپەڕێت بەسەر لەدایك بوونی یەکەمین ڕۆژنامە (کوردستان) کە لەلایەن ڕێبەری ڕۆژنامەگەری کوردی (میقداد مەدحەت بەدرخان) بە چاپگەیاندراوە لە شاری قاهیرەی ولاتی میسر، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کورد تەمەنی ڕۆژنامەگەری خۆی زۆر بەزەحمەت و پچرپچری بەڕێ کردووە لەژێر سانسۆر و چاوسورکردنەوەی ڕێککەوتنە کاتیەکانی کورد و ڕژێمەکانی ناوەند لە هەر چوار پارچەکەی کوردستان یان شاخ و ئاوارەیی بووە ، واتە تا سالی (١٩٩١) نەیتوانیوە بەپێی پێویست لە دونیای جوان و کەش و هەوای ئازادیدا نەشونما بکات، چونکە ڕۆژنامەگەری [illegible]امی مرۆڤە ئازادیخوازەکانە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری و

بنیادنـــانی دەســـەڵاتی دادپـــەروەری کۆمەڵایـــەتی ! هـــەر رۆژنامەگەریـــشە دەبێتـــە دەرمـــانێکی تـــازە بـــۆ چارەســـەرکردنی نەخۆشـــیەکانی دەســـەڵات و کۆمـــەڵگا بەبەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری و هۆشیاری تاکەکانی و دروست کردنی رای گشتی ! نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێ ئەوکەسانەی لـەبواری راگەیانـدن کاردەکەن ئامانجیـان زیاتر هاوکاری و کۆمەکیە بـۆ دروست کردنـی دونیایـەکی یەکسانی خوازانـەی دوور لەشەڕو رەگەز پەرستی و برسیەتی و پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ هەر لەبەر ئـەم چاونەترسی و بوێریەی خۆیان توشی زیندانی و لێپێـچنەوەو ئـازارو ئەشـکەنجەو تـا مردنیش دەبن ! بۆیە پیرۆزی پیشەی رۆژنامەگـەری لـە بـەهای ئـەم قوربـانی دانـەی دایـە کـەوەك مـۆم بـۆ روونـاکی خـەڵك دەتوێتـەوە لـەپێناو گەیـشتنی پەیامـە نوێخوازییەکەی .

# ئەنفال زامێکی سارێژ نەبوو

ئەنفال ئەو پرۆسە بەدناوە بوو کە لەماوەی کەمتر لە ساڵێك و بەچەندین قۆناغی یەك لە دوای یەك نزیکەی (١٨٢) هەزار مرۆڤی بێ تاوانی نەتەوەیەکی پێ (جینۆسایدی) کرا ، ئەو نەتەوەیەیی کە خاوەنی هەموو تایبەتمەندییەکانی (نەتەوەیە) لەسەر رووی زەمین، کەچی خاوەنی بستێ زەوی سەربەخۆ نیە لە سەر خاکەکەی خۆی! خاوەنی کورسیەك نیە لە پێکهاتەی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ئەوەی دەنگ هەڵبڕێ و لە ئازارەکانی خۆی بدوێ و بڵێ منیش نەتەوەم , خاوەن نیشتمانێکی لەتکراو و مێژوو زمان و ئایین و ئابوری سەربەخۆم ! بەڵام کەس بەدەنگمانەوە نایەت لە کیمیا باران و ئەنفال و لە سێدارە دان ! ئەنفال پراکتیزە کردنی بەرنامەو پرۆژەی فکری و سیاسی رژێمێکی شۆڤێنی بوو لە بەرامبەرگەلێکی خاك وئازادی لێ زەوت کراو ، ئەو گەلەی سەدان ساڵە نیشتمان و مرۆڤەکانی بونەتە نێچیری شمشێر بەدەستان و تاقیگەی چەکە تازەکانی سەردەم تا وای لێهاتووە ئێمەی کورد بەهەڵەبجەو ئەنفال و کۆچ رەو دەناسرێینەوە نەك بە داهێنان و گەلتورو هونەر ! جا نەتەوەیەك خاوەنی ئەو هەموو قوربانی دانە بێت کەی رەوایە خاوەنی کیانێکی سەربەخۆی خۆی نەبێت ! ئەوەی جێگای سەرسورمان و دڵتەنگی خانەوادەی ئەنفال کراوەکانە تائێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان نەك هەر ئەو قوربانییانەی بە شەهید ناونوس نەکردوە ، بەڵکو کەس و کاری ئەنفالکراوەکانمان لە بارو زروفێکی ئێجگار نالەبار ژیاون و دەژین ، کاتی ئەوەش هاتوە ئەو کەسانەی کورد و عەرەبن و تاوانباری ئەم کارەساتەن دادگایی بکرێن با لە مەودوا ١٤ی نیسانی هەموو ساڵێك بکەینە رۆژی بەرەنگار بونەوەی قرکردن و جینۆساید لە کوردستان با لەمەودوا لە ناوەندەکانی خوێندندا بە منداڵەکانی ئێستامان و ئەوەی ئاینده بڵێین ئێوە خاوەن هەڵەبجەو ئەنفالن ، چونکە ئەنفال و هەڵەبجە زامێکی سارێژ نەبووە لە جەستەی گەلێکی وون بوو.

## سڵاو لە هایین و ژوانیۆکانی ئێمە

چیرۆکی ( خۆشەویستی خەمناك ) ئەو زنجیرە درامایە بوو کە لە کەناڵی ئاسمانی (دبی) نیشاندراو چەند رۆژێك بەر لە ئێستاش هەمان زنجیرە بە دۆبلاژکراوی بۆ زمانی کوردی لە کەناڵی ئاسمانی (کوردستان تی ڤی) کۆتایی هات، من نامەوێت لێرە باسی ناوەڕۆکی دراماکە بکەم چونکە ئەو کەسانەی بە وردیو ئەلقە بە ئەلقە لەگەڵ هەناسەو خەمو ناسۆرییەکانی ئەکتەرەکان بوون بەتایبەتیش هەردوو کارەکتەری سەرەکی ( پارك هایین و ژوانیۆ ) لەمن باشتر دراماکە هەڵدەسەنگێنن، ئەوەی من مەبەستمە لێرەدا باسی بکەم تەنیا ئەلقەی کۆتایی یە کە بە مردنی ( ژوانیۆ )ی عاشق کۆتایی هات!

لەگەڵ مردنی ( ژوانیۆ )ش عاشقانی ئێمە بێ ئومێد بوون و تا ئەو رادەیەیی هەندێکیان پەنایان بردۆتە بەر (خۆکوشتن).

بەدبەختی ئێمە لەوەدایە لە شوێنی ئەو هەموو ململانێیە تەندروستەی لەنێوان ( ژوانیۆو یۆنگیۆ ) رویدا، لە شوێنی ئەو هەموو خۆڕاگری و قوربانیەی (هایین و ژوانیۆ) بۆ یەکتریاندا، لە شوێنی ئەو هەموو فرمێسکەی (هایین)و ئەو هەموو دیمەنە جوان و ووتە رۆمانسیانەی کە هەستی ئێمەی دەجوڵاند!

کەچی بەداخەوە عاشقانی ئێمە تەنیا کۆتاییەکەیان هەڵسەنگاند، هەرچەندە ئەم جۆرە کۆتاییانەش لە دراماکان زیرەکی و لێهاتووی نوسەری دراماکەو دەرهێنەرەکەی نیشاندەدات! بەڵام من دڵنیام ئەوان ئەوەندەی مەبەستیانە بیگەیەنن خاڵە ئیجابیەکان و خۆڕاگری و بەرگرییە لە راستییەکانی ژیان نەك تێکشکان و خۆکوشتن.

سادەیی ئێمەی بینەرو عاشق لەوەدایە هەر زوو خاڵە سلبییەکان وەربگرین چونکە کلتوورو ژیانی ئێمە پڕاو پڕە لە سەرکوت کردن و قەدەغەکردن و پێشێلکردنی ئازادییە تاکە کەسییەکان!
بۆیە گرنگە عاشقان و بینەرانی ئێمە خاڵە جوانەکان ببینن و فێری ململانێ و خۆڕاگری بن تا دایك و باوك و براکانیان رازی بکەن، راستگۆبن لەگەڵ خۆیان و دڵیان و کۆشك و تەلارو پارەی زۆر هەڵیان نەخەڵەتێنێ! هەرچەندە بۆ خۆشەویستی ئەم دوو ئەکتەرە چەندین سوپەرمارکێت و کوڕو کچ بە ناوی ئەوانەوە کراون، بەڵام نیگەرانیشم کاتێ لە هەفتەنامەکان ئەوەم خوێندەوە کە چەندین گەنج و عاشقان لەگەڵ کوشتنی (ژوانیۆ) هەوڵی خۆکوشتن یان داوە، لە کاتێکدا دوای ئەو هەموو ململانێیەی (یۆنگیۆ) لەگەڵ (ژوانیۆ)ی کرد (ژوانیۆ) خۆی کردە قوربانی هاوڕێکەی، بۆیە پێویستە گەنجانی ئێمە بیر لە بەردەوامی ململانێکان بکەنەوە چونکە ژیان هەمووی ململانێیەو ئەوەندە سادە نەبن لەگەڵ هەر دیمەنێکی تراژیدیاو وتەیەکی رۆمانسی و بەڵێنێکی قەبە بەرزو نزم ببنەوەو مردن و ژیان لەوێوە ببینن

# نامەیەك بۆ خۆشەویستەکەم

خۆشەویستەکەم رەنگە ئەمە دوا نامەبێت بگاتە دەستت ! چونکە لەم ولاتەدا پاسەوانی داب و نەریت خۆشەویستیان خنکاندووە و عاشقانیشیان هەڵواسیوە ، لەم مەفتەنە نابێ و نەشیاوە پیاو دەستی لە نێو دەستی هاوسەرەکەی بێت، جا چۆن دەتوانێ لەتەك خۆشەویستەکەی هەنگاو بنێ ! راستە لەم دەڤەرە کورەکان بۆیان هەیە داوایی هاوسەر گیری بکەن بەلام تا باوك و دایك و برا و خوشك و مامە و خالە و تیرە و هۆزەکانی رازی نەبن بە روخسارو کەسیەتی کچەکە ، قسەی کوریش هەرژانی دڵە .

ئازیزەکەم لەم نیشتمانەدا ناکرێ و نەشیاوە پیاوێك بزانێ خوشکەکەی پەیوەندی خۆشەویستی هەیە و ئەو نەی کوژێ بێ ئابروییە ! لەهەمان کات شورەییە بۆ کوری گەنج سێ چوار خۆشەویستی نەبێت بۆ کات بەسەر بردن ! لێرە بێ ئابروییە کچێ بە کورێ بلێ خۆشم دەوێت !

دڵە گیان لەم خاکەدا بەزار هەمووومان یەکترمان خۆش دەوێ کەچی هەمووشمان لەناخەوە رقمان لەیەکترە و خیانەت لەیەکتر دەکەین !لەم شەرمنستانە چاو و دڵەکان راست نالێن و ناتوانن باس لە خۆشەویستی راستەقینە بکەن لەترسی جەلدەی جەلادەکان رۆحەکەم دلتەنگ مەبە دەزانم لێرە ئارایش کردن و بێ لەچکی و ئاهەنگ و گوێ گرتن لە میوزیك و مەینۆشی تۆڵەو لێپێچینەوەی لەدوایە ! لەم ولاتە دا پاسەوانەکانی باخچەی شار چاویان وەك گورگ تیژبینە و رێگە بەدوو عاشق نادەن لەژێر دارێکی بێ سێبەر دانیشن خۆی ئاسا نەکا بێ ئەخلاقیەك بکەن و ئەو سەر شۆر بێت ! کەچی گەورەکانمان شەوانەیان بێ مەی و سۆزانیەکان نیە !

بەلام بەناوی داب و نەریت و ئاین ئەو عاشقانە سزادەدەن کە عەشقێکی پاك و بێگەردیان هەیە ! لەم ولاتە پڕ لەرق و قینە و چەك و پیاوسالاری چۆن دەکرێ پیاو رێز بۆ ئافرەتان دانێ و پرسیار بەئافرەت بکات بۆ راپەڕاندنی کاروبارەکانی ئاخر پیاو پیاوە !

ئازیزەکەم خەم مەخۆ توندوتیژی و تیرۆر تەنیا لەماڵەکەی تۆدانیە بەلکو لەنێو ماڵی هەموومانەو هەمووشمان تیرۆرستین بەرامبەر بەفکر، جوانی ، کچ ، خۆشەویستی ......... هتد

دڵەکەم ئەمانەو چەندینی تر بەربەستەکانی داب و نەریت ویاسای کۆمەڵگای ئێمەن بۆ رێگرتن لە عەشق و ئەوین, بم بووره مامۆستاکەم بۆ ئەوەی چیتر بۆنی خوێن و کوشتن نەکەم بۆ ئەوەی تۆ بپارێزم لە جەلادەکان پێت نەڵێم ماڵئاوا چونکە لەم وولاتەدا هەمووشتەکان لە سەربنەچەی حەرام حەلال و عەیبە گۆش کراوە, بەکێ بڵێم هۆشیار بەرەوە ! لەکاتێك دا منی لاخوا نەناس و مولحیدە بۆیە لەدوا نامەدا هیوای ژیانێکی خۆش و پڕ لە بەختەوەریت بۆ دەخوازم ! تکایە دوای خوێندنەوەی نامەکەم بیسوتێنە وەك دلی خۆم بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر دەستی جەلادەکان ! بەلام دڵنیابە ئێستاش زۆر لەجاران زیاتر خۆشم ئەوێیت .

# بەرەو کۆنگرەی یەکێتییەکەمان

کۆنگرە وەك بنەمایەکی دیموکراتیانە لە ژیانی حزبی و ڕێکخراوەیی پەیڕەو دەکرێ، بەتایبەتی لە نێو ئەو حزب و ڕێکخراوانەی کە باوەڕیان بەبنەماکانی دیموکراتییەت هەیە بە گوێرەی پەیڕەوی نێوخۆیان کۆنگرە دەبەستن وەك وێستگەیەك بۆ پیاچوونەوە بە کارو ئەنجامەکانی ڕابردوو بەتایبەتیش هەڵوەستەکردن لەسەر جێبەجێ نەکردنی بڕیار و ڕاسپاردەکانی کۆنگرەی پێشوو هۆکاری دروست بوونی خاڵە لاوازەکانی ژیانی ڕێکخراوەییان ، لەهەمان کاتدا بۆ داڕشتنەوەی بەرنامەو پڕۆژەی سەردەمیانە کە بگونجێ لەگەڵ واقیعی ژیانی ئەمڕۆی کۆمەڵگاکەیان .

یەکێتی لاوانی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق وەك ڕێکخراوێکی جەماوەری دیموکراتی باوەڕی بەبنەماکانی دیموکراتیەت هەیە و بە گوێرەی پەیرەوی نێوخۆی لەکات و ساتی دیایکراو کۆنگرەکانی خۆی دەبەستێ لە پێناو تازەکردنەوەی بەرنامە و پڕۆژەکانی بۆ خزمەتی زیاتری توێژی گەنجان، ئەم یەکێتییە وەك ڕێکخراوێکی سەربەخۆی گەنجانە لە کوردستانی باشوور و بەگوێرەی یاسایی کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان مۆڵەتی کارکردنی هەیە بۆ گەشەپێدانی بەهرەو تواناکانی لاوان .

بێگومان ڕۆڵی ئەم ڕێکخراوە و ڕێکخراوەکانی تری کۆمەڵی مەدەنی ئەوەیە کە وەك ئەڵقەیەکی پەیوەندی لە نێوان دەسەڵات و توێژەکانیان کار بکەن بۆ گەیاندنی پەیامی هەردوو لاو جوانترکردنی سیمای سیاسی و مەدەنیانەی دەسەڵات و تاکەکان ! بەڵام بەداخەوە هەست دەکرێت لە کوردستان جگە لەوەی تێکەڵ کێشیەك لە کاری حکومەت و حزب دا هەیە ! لە هەمان کاتدا حکومەت هیچ نرخ و بەهایەك بۆ

ڕێکخراوەکـان دانـانێ و هاوکاریـان نییـە لـە جێبـەجێ کردنـی پـڕۆژە و داواکاریـە گـشتیەکانیان کـە لـە خزمـەت توێژەکانیاندایـە ! لەلایـەکی تریـشەوە توێـژە جیاجیاکانی کۆمەڵگای ئێمەش ئەرکی سەرەکی ڕێکخراوەکان نازانن کە بە پلە یەك بریتییە لە هۆشیارکردنەوە بە خولی ڕۆشنبیری و زانستی و وەرزشی و هونەری و ... هتـد ، وە بـە پلـەی دووەمـیش داکـۆکی کردنـە لـە مافـەرەواکانی توێـژەکانیان و پەیوەندی کردن لە نێوان دەسەڵات و تاکەکان بۆ ئاڵ و گۆڕکردنی بیر و ڕاکان و ...هتـد ، هەرچـەندە هەنـدێ ڕێکخـراو بـە سیمایەکی زەقـی سیاسـی کاردەکەن و لـە ئـەرك و پەیامـە ڕاسـتەقینەکەی خۆیـان لایانـداوە و کـاری حزبـی و ڕێکخراوەییـان تێکەڵ کردووە ، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە تاکەکانی نێوان کۆمەڵگا بە تایبـەتیش توێژی لاوان ئومێدیان بەم ڕێکخراوانە نەبێت و بە بارەگای حزبیان بزانن!

بۆیە کۆنگرەی ئەمجارەی یەکێتییەکەمان بە ئەرکی خۆی دەزانێ کە هەڵوێستەیەکی جدی بکات بـۆ گێڕانـەوەی پـەیامی ڕاسـتەقینەی ڕێکخراوەیـی و لـە هـەمان کاتیـشدا جـەخت لەسـەر هێنانـەدی داوا ڕەواکـانی لاوان دەکینـەوە و داوا لـە حکومـەتیش دەکـەین کـە باشـتر ئـەرکی سەرشـانی خـۆی جێبـەجێ بکـات بەدەسـتە بـەرکردنی مافەکانی لاوان و گوێگرتن و هاوکاری کردنی ڕێکخراوەکان بەبێ جیاوازی .

سەرکەوتوبێت کارەکانی کۆنگرە لە پێناو گەشەپێدانی فیکری و جەستەیی لاوان بـۆ بنیادنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی

# زیاتر لە نیو سەدە تێكۆشان

٢٠٠٩/١٠/١٥ ڕۆژێكی پڕشنگدارە لە مێژووی جولانەوەی لاوانی عێراق و كوردستان ، لەم ڕۆژەدا(٥٨) پەنجاو هەشت ساڵ تێدەپەڕێت بەسەر تەمەنی یەكێتییەكەمان ، یەكێتی لاوانی دیموكراتی عێراق و یەكێتی لاوانی دیموكراتی لە كوردستانی عێراق، یەكێتییەكەمان هەر لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە تاكو ئێستاش ڕۆڵێكی بەرچاوی بینیوە بۆ ڕێكخستنی توێژی لاوان و وەك نێوەندێك بووە بۆ پەروەردەكردن و ڕۆشنبیر كردنیان و هێنانەدی خواست و حەزەكانیان و چۆنیەتی داكۆكیكردن لە خۆیان بۆ هێنانەدی مافەكانیان ، جگە لەمانەش بنكەیەك بۆگۆشكردنی لاوان بە مەسەلە چینایەتی و فیكری و نیشتمانییەكان لەم ڕووەش ناتواندرێ لە ڕۆڵی یەكێتییەكەمان كەمبكرێتەوە ، چونكە هەر لە ڕیزی ئەم یەكێتییەدا چەندین كەسایەتی ڕۆشنبیر و سیاسی و نیشتمان پەروەر لەسەر ئاستی عێراق و كوردستان سەرەتای هاتنە نێو كاری سیاسی و ڕۆشنبیری و هونەرییان لەم ڕێكخراوە بووە و خۆیان و مێژووش گەواهی ئەم ڕاستییەمانن ، جا چی لەمە پیرۆزترە تۆ نەوەیەك پەروەردە بكەیت بە گیانی لێبوردەیی و نیشتمان پەروەری و یەكسانی و پێشكەوتنخوازی ، بۆ هێنانەدی دەسەڵاتێكی دیموكراتی كە لە سایەیدا قبووڵی جیاوازی فیكری و سیاسی و ڕێكخراوەیی بكات ، یەكێتییەكەمان لەم تەمەنە پڕ شكۆیەیدا توانیوێتی لە نێو سەرجەم شارو شارۆچكە و دێهاتەكانی كوردستان و عێراق ڕۆڵی خۆی ببینێ بۆ هۆشیاركردنەوە لە دژی چەوسانەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی . لە زۆربەی كاتیش بەشداربووە لە كارە پارتیزانییەكان لە دژی ڕژێمە

یەك لە دوای یەكەكان و كەسانی وڵات فرۆش و توانیویێتی رۆڵی خۆی ببینێ لە تەك حزبە نیشتمان پەروەرەكان ، گومانی تیانییە ئەم مێژووە دوورو درێژە بەبێ گیانفیداكاری و زیندانی كردن و راوەدوونان نەبووە كە لاوانیش سەرمەشق و داینەمۆی ئەم ریكخراوە بوونە ئەوا سڵیان لە شەهید بوون و زیندانی نەركردۆتەوە و لە پێناوی رزگاری نیشتمانی و عەدالەتی كۆمەڵایەتی ، یەكێتییەكەمان جگە لەوەی قوتابخانەیەك بووە بۆ هۆشیاری توێژی لاوان بەبێ جیاوازی رەگەزی و نەتەوەیی و ئایینی و فیكریش نێوەندێك بووە بۆ لێك حاڵی بوون و پێكەوە ژیانی نەتەوەكان و قبوڵكردنی یەكتر لە پێناو ژیانێكی ئازاد و ئاسوودەو دوارۆژێكی باشتر بۆ لاوان ، لەم رووەوە یەكێتییەكەمان ئەم خەباتەی بە ئەركی خۆی زانیوە بۆ خزمەتی توێژی لاوان لە كوردستان و عێراق بەڵكو هەر بەوەندەش نەوەستاوە و لەو رۆژەوەی وەك ئەندامێكی یەكێتی لاوانی جیهان قەبول كراوە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت یەكێتییەكەمان وەك زمانحاڵی لاوانی سەرخاكی عێراق و كوردستان توانیویێتی لە فیستیڤاڵ و كۆنگرەكانی لاوانی جیهان باس لەو ئیش و ئازار و تاوانانە بكات كە رژێمە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق بەرامبەر بە توێژی لاوانی كردووە، باس لەسەرجەم پێشێلییەكانی مافی مرۆڤ بكات لە عێراق و كوردستان ، لە دوای راپەرینە مەزنەكەی بەهاری ١٩٩١یش راستەوخۆ تێكەڵ بە ژیانی لاوان بۆ وە و لە ١٩٩١/٣/٩ توانی یەكەم بارەگای خۆی لە شاری سلێمانی بكاتەوە و دەست بەكار و چالاكی بكات و لەگەڵ داوا رەواكانی توێژی لاوان بووە و داكۆكی كردووە لە مافی سیاسی و سەربەخۆیی گەلی كوردستان و بەدەمیان رێپێوان و مانگرتنی رێكخستووە و لەسەرەتای شەڕی براكوژیش هەرزوو هەستی بەم مەترسیەكردووە و دەستنیشانی ئاكامە خراپەكانیشی كرد . بۆیە وەك رێكخراوێكی فشاربەر بەرۆڵی خۆی هەڵساوە لە دژی شەڕی خۆكوژی ئێستاش كە پرۆسەی ئاشتی بەرەو پێشەوە چووە و لەسەر ئاستی پەرلەمان كۆبوونەواتی ئاسایی ئەنجامدرایەوە ئەوە گەورەترین دەسكەوتی ئاشتیخوازانەی رێكخراو و حزبەكان كە رۆڵیان بینیوە لەم نێوەندەدا.

لەم یادە پیرۆزەدا هیوای بەرەو پێشەوەبردنی زیاتر دەخوازین بەڵێنیش ئەدەین هەرچی لە توانای ئێمەدا هەبێت دریغی نەکەین لە پێناو خۆشگوزەرانی توێژی لاوان، ئومێدەوارین دەسەلاتدارانی کوردستانیش هەوڵی ئەوە بدەن زەمینەیەکی خۆشتر برەخسێ بۆ رۆڵی ریکخراوە فشاربەرەکان و هاوکاری بکرێن بەبێ جیاوازی نەتەوەیی و فیکری بۆ ئەوەی بە هەموو لایەکمان وڵات جوانتر و رازاوەتر بکەین و لێکحاڵی بوون و قبوڵکردن بۆچوونی جیا ببێتە هۆی ململانێی زیاتر لە پێناو خزمەتی باشتر بۆ ژیانی لاوان و کۆمەڵ بە گشتی .

## لە پەراوێزی راستییەکاندا

کەباس لە دامەزراندنی هەر بزوتنەوەیەك یان رێکخراوێك یان حزبێکی سیاسی دەکەین نابێ ئەوەمان لەیادبچێ کە ئەوانەئامرازێکن بۆ گەیشتن بە ئامانج ، کەواتە هەموو ئامانجێکی نیشتمانی یان نەتەوایەتی یان دیموکراسی یان رۆشنبیری و ئازادی .... هتد دەبێ ئەو رێکخراوو حزبانە دروست بکرێن ! وە بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش پێویستە خەلکانی تێکۆشەر و گیان بەخت کەرو خۆ بەخشی هەبێ ، لێرە دا ئامانجە پیرۆزەکە دەبێتە هاندەر بۆ بەرەو پێشەوەبردن و فراوانترکردنی رێکخراوەکە یان حزبەکە چونکە ئامانجەکان ئامانجی گشتین لەم پێناوەدا ئەندامانی ئەو حزبە توشی دەیان گرفت و برسیەتی و شەر و زیندانی و ئازار و ئەشکەنجە و تا شەهید کردنیش دەبنەوە , یان بەیەکجارەکی ئەو حزب و رێکخراوە نامێنێ و هەلدەوەشێتەوە جا بەهەر هۆکارێك بێت ئەمەشیان زۆر بەکەمی روودەدات تەنیا گەر ئەو ئامانجەی بۆی تێدەکۆشن کاتی بێت یان گشتی نەبێ ،

بێگومان بۆ درێژەپێدان بەژیانی ئەو حزبە و بەر فراوانکردن و بلاوکردنەوەی بیرو باوەرە پیرۆزەکانی بەهەزاران کەس سەرگەردان دەبن بەخۆیان و مال و منداليان ئیتر چی لەوە گەورەترە مرۆڤێك لەپێناوی فکرەیەك یان پاراستنی خاکەکەی هەموو خۆشیەکانی ژیان بەلاوەبنێ و گیانی خۆشی بکاتە قوربانی کیشە رەواکەی ، بەلام دوای هاتنەدی ئامانجەکان ئەومرۆڤە لەیاد بکرێت ئاورێك لە دایك و باوکە پیرەکانی و مندالەبێ نازەکانی نەدرێتەوە ئالێرەدا ئینتمای نیشتمانی و نەتەوایەتی بەردو لاوازی دەچێت ،بەداخەوە لەم وولاتەی ئێمە دا خەلکانێکی ئێجگار زۆر هەیە لە رۆژگارە سەختەکان زۆرترین قوربانی داوە و بووە بەربەستێك لەبەردەم سوپا زل

هێزەکانی رژێمی فاشی بەعس ! کەچی لەلایەن دەسەلاتی کوردیەوە بە بروبیانوی حزبایەتی تەسك ئەو جۆرە قارەمانانە خۆیان و خێزانەکانیان کە پالەوانی رۆژانی بەرگری کردن بوون لە نیشتمان و نەتەوەکەمان ئیستا بەکۆلەمەرگی دەژین و مەترێك زەوی شك نابەن لەم وولاتەی بەخوێنی ئەوان ئاودراوە موچەیەکی رێزلێنانیان پێ شك نابیندرێ لەبەر ئەوەی سەر بەحزبیە کانی دەسەلات نین و باوەریان بەبەش کردنی کوردستان و میرنشینە سەوز وزەردە نیە کەچی بەهەزاران کەس پێشمەرگە کوژو رفیق حزبەکان و مەفرەزە خاصەکانی دوێنێ بونەتە پالەوانەکانی ئەمرۆ و مەدالیای شەرەف و بەرگریان پێوەدەکرێ و پلەو پایەی بەرزی پێشمەرگایەتیان پێدەبەخشرێ و سەدان دۆنم زەوی بەو موچە خەیالیەی دەیان درێتێ دەکرن و دەبنە خاوەنی چەندین کۆمپانیا ! بەراستی ئێوە پالەوانن و شایستەی زیاترن ئێمەی برسی و رەش و روتیش خۆمان و خێزانەکانمان خۆفرۆشبوین بمان بوورن .

# نا بۆ شەڕی براکوژی

گەلی کورد بەدرێژایی مێژووی زۆربەی کات کەوتۆتە نێو هەرەشەو شەری بەرگری لە خاك و نەتەوەکەیدا ، راستە زۆربەی نەتەوەکانی تریش بەم قۆناغە دا تێپەریون ، بەلام خۆشبەختانە دوای ململانێیەکی زۆر گەیشتونەتە مافەکانیان و ئێستا خاوەنی کیانی سەربەخۆی خۆیانن ، ئەمەش بەیەك ریزی و یەك دەنگی و یەك هێزی بووە بۆ بەرگری لەو خاکەی لەسەری دەژین چونکە زۆربەی ئەو دەولەتانەی کە ئێستا خاوەنی کیانی سەربەخۆی خۆیانن لەرووی سیاسی و ئابووری و زمان و ..... هتدی لەلایەن کەسانێکی بە بەزەی پێیان نەدراوە ، بەلکو بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بەشێکیان هەر لەقۆناغی کۆمۆنەی سەرەتایی و کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری ئێستا لە ململانێ دابوونە لە پێناو رزگاری نیشتمانی ، ئەوەی گەلی کوردی لەم کاروانە مێژووییە جێ هێشتووە زۆر هۆکاری دەرەکی هەبوونە بەلام هۆکاری ناوخۆیش هیچی کەمتر نەبووە لە دەرەکیەکان ، هەر لەسەرەتایی دروست بوونی ویلایەتە بچوکەکانی کورد بە میدیە و بابان و ئەردەلان و سۆران و بۆتان....هتدی ململانێ نێوخۆی هەبووە لە نێو خودی بنەمالەی میرەکان و میرنشینێك و میرنشینێکی تر هەر لەبەر ئەم هۆکارانەش زۆر جار روخانی میرنشینێك بە پلان و هاوکاری میرنشینێکی تر بووە بە پالپشتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەکان یان صەفەویەکان بووە !

هەرچەندە دوای راپەرینی ١٩٩١ قوناغیکی تازەتر بۆ گەلی کورد رەخسا و لەتەواوی جیهان ئەوەی رۆژێ گوێ بیستی ناوی نەتەوەیەك نەبووە بە ناوی ( کورد ) و خاکێك بەناوی ( کوردستان ) لە کاتی کیمیاباران کردنی هەلەبجە و راپەرین و کۆچ رەو ..... هتدی !

زانیان کە نەتەوەیەك هەیە خاوەنی خاك و زمان و کلتورو ئابووری خۆیەتی لە سەدەی بیستەم کەچی هێشتا لەژێر دەستەی و داگیر کردن دایە ئەوەی دووبارە گەلی کوردی بەدنیا ناساندەوە کۆچ رەوە چەند ملیۆنیەکە بوو لە دژی زولم و زۆری

و درندەی بەعس لە ٣١ / ٣ / ١٩٩١ هەر ئەم کۆچ رەوەش زوومی کامێرایی زۆربەی کەنالەکانی جیهانی خستە سەر نەتەوەیەك کە لەترسی ( جینۆساید ) خاکەکەی خۆیان جێهێشتووە هەر ئەم کۆچ رەوەش بوە هۆی ئەوەی هاوپەیمانان هێلی ( ٣٦ ) دیاری بکەن کە بەهێلی پاراستن ناسراو بووە هۆی دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەت !

بەلام بەداخەوە ئەوەی ئێمەی کوردی ناشرین کرد گەلەکەمانی دواخست لە قۆناغی رزگاری نیشتمان هەم دیسان گەراینەوە بۆ مێژوو ئەویش شەری ناوخۆیە لەپێناو بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی .

هەر ئەم شەرە خۆکوژیەش بووە هۆی داروخانی سەر جەم کایە کانی ژیان و دەیان دیاردەی نێگەتیفی لەگەل خۆی هێنا کە کۆچی لاوانیش باشترین وەلام بوو بۆ دەسەلاتی شەرخوازان !

بۆ یە گرنگە سەرکردەکانی شەر بگەرێنەوە نێو پرۆسەی دیموکراسیانە و واز لەشەری براکوژی بهێنن بۆ ئەوەی ئەم جارەیان ئەم هەلەمان لەدەست نەچێ و پەرە بەژیانی نەتەوەکەمان بدەین و هەنگاو بنێین بۆ سەربەخۆی کوردستانەکەمان چونکە هەموو وولاتانی دونیا دوای ململانێیەکی زۆری دەرەکی و نێوخۆی گەیشتوونە ئەو باوەرەی کە ژیانی دیموکراسیانە و ئازادانە دەتوانێ بیان پارێزێ و ژیانیان باشتربکات نەك شەر و مال وێرانی ! تاقیکردنەوەکانی مرۆڤایەتی سەلماندویانە ژیان پێویستی بەبیر و بۆچون و کار و هەولدانی هەموو مرۆڤێکەو ، وولات بە هەمووتاکەکانی پارێزراو سەرکەوتوو دەبێت ، نەك بە شەر و خوێن رشتن و کاولکردنی شاران ، راستە لە شەردا بەهێزەکان سەردەکەون بەسەر بێ هێزەکان و خۆیان بەبراوە دەزانن بەلام لەراستی دا لەشەر براوە نیە چونکە مرۆڤەکانی تێدا دەکوژرێ بەتایبەتیش شەری نێوخۆی یەك نەتەوە یەك وولات مارکس وتەنی ( مرۆڤ بەنرخترین سەرمایە یە ) کەواتە تۆ بەنرخترین سەرمایەی خۆت لەناودەبەیت کە خودی مرۆڤە جا براوەیی لە کوێ دایە براکانم ! بۆیە نا بۆ شەر ! شەر دوژمنی ژین و توخمی ئینسانە .

# حکومەتی ئایندە و خواستەکانی جەماوەر

دوای پرۆسەیەکی دور و درێژ لە ململانێ و شەری براکوژی و ئیحتیکار کردنی دەسەلات و دوو ئیدارەیی و بەش کردنی شارو گوندەکان لەلایەن هەردوو حزبی دەسەلاتدار گەیشتنە ئەوباوەرەی کە هەموو بەیەکەوە جوانین و کوردستان پێویستی بە هەموو لایەکمانە ؛ یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەکە خواستێکی لە مێژینەی هەموو چین و توێژەکانی گەل بووە ، بەلام بەداخەوە بەرژەوەندیە تەسکەکانی حزبایەتی خرابووە پێش بەرژەوەندیە گشتیەکانی جەماوەر ، دەبێت حزب و حکومەت ئەوراستیە باش بزانن بەبێ کۆمەل بوونی ئەوانیش هیچ مانایەکی نیە ، چونکە حزب خۆی بانگەشەی بۆ جوانتر کردن و خۆشگوزەرانی وولات دەکات لەپێناو باشترکردنی ژیانی مرۆڤەکان کەواتە حزب لە پێناو ئامانجە گشتیەکان دادەمەزرێت نەك ئامانجە فەردیەکان ، بۆیە گرنگە هەرکاتێك حزبیش کە گەیشتە دەسەلات ئامانجە گشتیەکان فەرامۆش نەکات ، جونکە حکومەتێك ئەگەر بەتەنگ کێشە و گرفتەکانی هاولاتیانەوە نەچێت کەواتە حکومەتی هاولاتی نیە بەلکو حکومەتی نوخبەیەکە ، ئەمەش مانای لاوازی دەسەلات و حکومەت دەگەینێ چونکە حکومەت دەبێ لەپێناو زۆرینە ژیان باشتربکات ، بۆ ئەوەی لەپرۆسەی هەلبژاردنی داهاتوو متمانەی بەدەست بهێنێتەوە نەك حکومەتێك داهاتی خەلك بشارێتەوە بۆیە ئەرکە لەسەر حکومەتی ئایندە بەبێ جیاوازی فیکری و ناوچە گەری خزمەتی ئەم وولاتە بکات وئەو کەم تەرخەمیانەی لەرابردوو بەهەر بیانویەك بێت کە هەی بووە ببێتە پرۆژەی پلەیەکی بەتایبەتی نەهێشتنی دیاردەی تەزکیە و گەندەلی ئیداری و گرانی نرخی کەل و پەل لە بازارەکان بەبیانوی بازاری ئازاد و گرفتی کەمی شوێنی نیشتەجێ بوون و بێ کاری ........ هتد.

بۆ ئەوەی لە هەر پێشهاتێکی سیاسی لە ناوچە کە و بەتایبەتی پلانەکانی رژێمی فاشی بەعس و وولاتانی ئیقلیمی بۆ سەر ئەزموونەکەمان هاولاتیان داکۆکی لە حکومەت بکەن و ببنە پەرژینێك بۆ پاراستنی ئەم دەسکەوتە کە بەخوێن بنیات نراوە .

# کە ئاشتی هەیە (PMF) بۆ بمێنێ؟

شەڕی نێوخۆ چی ما پێمانی نەکات! ئەوەی لەسەردەمی رژێمی بەعسدا لەسەر هەڵوێستی سیاسی و نەتەوایەتی پێمان دەکرا، ئەوە دووبارە بۆوە! ئەوەی دوای راپەڕینی (۱۹۹۱) بەدەست و بازو و هێز و خوێنی جەماوەری چەوساوە هاتە بنیادنان، کەوتە بەرمەترسی و داڕووخان، ئەو ولاتانەی لە رۆژهەلات و رۆژئاوا لەسایەی هەڵەبجەو کۆچڕەو کوردیان ناسی بەبراکوژی لەئەقڵی خۆیان وەلاوەنا!

ئەوەی بەدرێژایی مێژوو چەوسێنەرو جەللادی ئەو میللەتە بووە دەستمان گرتووە داوای هاوکاریمان لێکردون و کەوتە فڕکردنمان پەنا بردرایە بەر ئەوانەی ببون بە بەربەست و روخانی ئیماراتە بچوکەکانی (بۆتان و ئەردەلان و سۆران وبابان و تاوانبارانی هەڵەبجە و ئەنفال و ...هتد). لینینی مەزن دەڵێ: " گرنگ ئەوەنییە مرۆڤ هەڵە بکات، گرنگ ئەوەیە دووبارەی نەکاتەوە" بەڵام نازانم بۆچی ئێمەی کورد پەند لە مێژوو و بەسەرهاتەکانمان وەرناگرین! ئەوانەی ئێستاکەش پیلان داڕێژەرو دژ بەفیدرالین چ جای سەربەخۆیی، ئەوە خۆمان داوایان لێدەکەین ببنە پارێزەرو دادوەری گەلەکەمان.

(پی.ئێم.ئێف) یەکێکە لەو بەناو دادوەرانەی کە شەڕی نێوخۆ دەستی گرت و هێنایە پایتەختی هەرێمی کوردستان، ئەو هەولێرەی کە مێژووی مرۆڤایەتی دەزانێ کە وڵات و نیشتمانی کوردانە، کەچی فوتابیانی کۆلێژەکەی (پی.ئێم.ئێف) بەخاکی تورکمان و تورکیای ناودەبەن، لەکاتێکدا هەموو کوردێك و ولاتانی ئیقلیمی و هەموو ئەوانەی بەتەنگ کێشەی گەلی کوردەوە بوون، دەزانن لە گەرمەی جەولەکانی شەڕ بوو کاتێ نیشتمانپەروەر و سیاسەتمەداری کورد هاوڕێ (عەزیز محەمەد) توانی شەڕ بەهەردوو لایەن رابگرێ و وەك دادوەرێکی بێ بەرژەوەندی

حزبی و تایبەتی و وەك کۆترێکی ئاشتیخواز هەفتانە لەنێوان مەجلیسی هەردووبرا دادەنیشت ، ئینجا بەرەو ڕێکەوتننامەی واشنتۆن چوون ، بەڵام نازانم بۆ (پی .ئێم .ئێف) بوو بەوارسی شەرعی ئاشتی ! لەکاتێکدا دەبووایە خەڵاتی ئاشتی بدرایە بە هاوڕێ (عزیز محەمەد) ، کەچی گەورەترین و خۆڕاگرترین تەلاریان ڕازاندەوە بۆ بارەگای (پی .ئێم.ئێف) دەبێ بەرژەوەندی گەلی کورد لەوە دابێ کەلە نێو سەربازگەی (پی .ئێم.ئێف) برا تورکمانەکانی کوردستانمان لێبکەن بە کۆماندۆس و ئارنۆڵد و رامبۆ تاسەرکردەکانمان بڕفێنن ، یان وەك تورکیا دەڵێ ئامادەیان دەکەن بۆ گرتنەوەی ویلایەتی موسڵ و کەرکوك ! لەو باوەڕشدانیم کە ئەمە سەفارەتێکی دیبلۆماسی سیاسی تورکیابێت ، چونکە ڕۆژانە سنوری وڵاتەکەم پێشێل دەکات و دێ هاتەکانمان بۆردوومان و خاپور دەکات ! ئەی باشە لەم سەربازگەیەدا چ بەرنامەیەکی شاراوە دادەڕێژرێ بۆ بەتورککردن و ڕەشکردنەوەی ناوو مۆرکی نەتەوایەتیمان بەدەستی تورکیاییەکان! دەبێ ئەمجارەیان ناوە پیرۆزەکەی (هەولێر) بگۆڕدرێتە سەرناوی کام خلیفەی عوسمانی و سەرکردەکانی ئەتاتورك و بکرێتە مەوتەن و شوێنی لەدایکبوونی کام (جەنەراڵ) ؟

من لێرەوە پرسیار لە هەردوو حزبی باڵا دەست دەکەم لەو کاتەوەی (پی .ئێم.ئێف) هاتۆتە کوردستان چەند هەنگاو ئێوەی لەیەکتر نزیك کردۆتەوە؟! چەند خزمەتی بەپرۆسەی ئاشتی کردووە؟ چی خستۆتە نێو هەگبەی کۆبوونەوەکانتان کە لەخزمەتی گەلی کورد دابێ جگە لەفشار خستنەسەر دەسەڵات بۆ فراوانترکردنی کاری سیاسی و عەسکەری تورکمانەکانی دار و دەستەی خۆیان ؟! گەر زیاتریشیان کردووە با باسبکرێت بۆ ئەوەی ئێمەش بەخراپ ناوی (پی .ئێم.ئێف) نەهێنین ، ئەگەر نا ئەم بێ دەنگییەتان لە پای چی براکانم ؟

# با راستگۆبین مێژوو شاهیدە

خەریکە باوەر بەو حزبانە بکەم کە لەمانگی ئاداری هەموو ساڵێك هەر حزبە و بە ئاوازێك دەڵێ من دۆل و شاخ و دێ و ناحیە و قەزاو شارەکانم رزگار کرد !خەریکە منیش باوەر بەو حزبانە بکەم کە باس لە ناحیە و قەزا و شارێك دەکەن کە گوایە لەوەتەی دروست بوونی ئەم شوێنەوە قەلاو پشتیوانی ئەو حزبەن و تەنیا رێکخستنی ئەو حزبەی تیایە ! کەچی لە هەلبژاردنی شارەوانی بە پارەو بەلێنی بریقەدار دەنگیان کۆدەکردەوە ! خەریکە باوەر بەو حزبە بکەم کە بەرۆژی رووناك داستانی حزبێکی تر دەکاتە هی خۆی ! خەریکە منیش باوەر بەو حزبەبکەم کە دەڵێ راپەرینی (٦) ئازار ی ساڵی ١٩٩١ ی هەولێر کە رێگە خۆش کەر بوو بۆ ( ١١) ئادار گوایە بەهاوکاری لەگەل شیوعیەکاندا ئەنجامیان داوە ! لەکاتێك دا جگە لە شیوعیەکان وشانەیەکی پچراوی حزبێکی تر تەنیا جاش و مفرمزە خاسەکان لە هەولێر بوون هەر ئەوانیش شیوعیەکانیان بریندار کردوو راپەرینەکەیان شکست پێهێنا ! ئەترسم ئەوەی داهاتوو باوەر بەو حزبە بکەن کە تەقەیەکی بە رژێمی بەعس وەنەناوە کەچی لەیادی راپەرین باسی خۆراگری و رۆلی کەسێك دەکات لەراپەرین کەچی لەساڵی ١٩٩٣ هاتۆتە رێزیان و لە شەری نێو خۆ کوژراوە ! خەریکە منیش باوەر بە لێهاتووی و دلسۆزی و نیشتمان پەروەری ئەو جاش و مفرمزە خاصانە بکەم کەدەمیان هەلاتوی سەربازیان بە پێشمەرگە لە قەلەم داوە و تەسلیمی بەعسیان کردۆتەوە ! کەچی ئەمرۆ بە سەربوردەی حزبێك دەبێتە ( تنقیم داخیلی ) و سەرکردەی ئازادکردنی ناوچەیەکی بەرفراوان لە راپەرینی ساڵی ١٩٩١ ،

بەراستی سەیرە گەر حزبەکان ئەو هەموو رۆڵەیان هەبووە لەناو شارەکان بۆ لەسالانی ١٩٨٨ بۆ سالی ١٩٩١ گوێمان لە رفاندن و کوشتنی بەعسیەك و جاشێك و داستانێك نەدەبوو ! سەیرە بەلامەوە ئەو حزبانە باس لەرۆلی خۆیان دەکەن لەراپەرین و جەماوەر دەکەن بەپاشکۆی ! ئەی بۆچی ئەو حزبانە لەکا تی روخانی دێهاتەکان و ئەنفال و کیمیاباران کردنی هەلەبجە رانەدەپەرین لەنێو شارەکان ! ئەی باشە بۆ کەبرینداەرەکانی پاشماوەی کیمیابارانی هەلەبجەیان هێنایە ئۆردوگایی ( بەرحوشتر ) لەهەولێر جگە لە خەلکی دلسۆزی هەولێر مەفرەزەیەك یا پێشمەرگەیەکی حزبێك هاوکاری و سەردانی نەدەکردن ! کە تەنیا یەك بنکەی پۆلیس لەم ئۆردوگایە هەبوو , بۆیە من لێرەوە داوا لەهەموو حزبەکان دەکەم کە مێژوو شاهیدە با راستیەکان وەك خۆی باس بکەین ! چونکە راپەرین رق و کینە و هۆشیاری جەماوەر بوو بەهاوکاری هێزێکی بەژمارە کەمی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی نەك راپەرینی حزبێك ! بۆ ئەم راستیەش با حزبەکان ئەو شەهیدانە سەرژمێر بکەن کە لەرێکخستنی ئەوان کاریان کردووە لە ( ١٩٩١ /٣/٣١ ) شەهید بوونە سەرژمێریەکی ئەو هاولاتیانەش بکەن بۆیە ئەبێ هەموو لایەکمان دان بەو راستیە دابنێین کە راپەرین ١٩٩١ شۆرشی جەماوەر بوو دژی جەور و ستەمەکانی بەعس نەك شۆرشی تاکە حزبێك بێ

# هێرشەکانی تورکیا نامانترسێنێ

بەگوێرەی چاودێرانی سیاسی لەدوای راپەرینە مەزنەکەی بەهاری سالی ١٩٩١ نزیکەی (٣٠) جارە سوپایی تورکیا ئۆپەراسیۆنی سەربازی بە بروبیانوی جۆراو جۆر لەسەر سنور و لەنێو خاکی هەرێمی کوردستان ئەنجام بدات إجگە لەمەش بەسەدان جار دەرگای سنوری نێوان (ئیبراهیم خەلیل و سلۆپی ) داخستوە و بۆتە هۆی بەرز بوونەوەی نرخی کەل و پەل و خۆراك إ لەوانەش مەترسیدار تر بەروون و ئاشکرا باس لەوە دەکات تورکمانەکانی کوردستان و ویلایەتی ( موصل ) بەشێکە لەخاکی تورکیا هەر بۆ ئەم مەبەستەش هاوکاریەکی مادی و مەعنەوی باشی هەندێ رێکخراو حزبی تورکمانیەکان دەکات ، ئەوانیش لە چوار چێوەی بەرەی تورکمانی خۆیان رێکخستووە دژی هەموو پێشکەوتن و مافەکانی گەلی کوردستانن ،

گومانی تێدانیە ئامانجی تورکیا لەو هەموو دەست تێوەردان و هەرەشەیە بەروون و ئاشکرا دیارە ئەویش شکست پێهێنانی ئەزمونەکەمانە چونکە لەوە دلنیایە سەرکەوتنی سیستەمی فیدرالی لەعیراق بە پلەی یەکەم لەبەرژەوەندی کورد دایە و رەنگە هەر ئەم فیدرالیەتەش زەمینە خۆش بکات بۆ جاردانی سەربەخۆی کوردستانی باشور لە هەمان کاتدا تورکیا لەوەش دلنیایە هەر سەرکەوتنێکی کورد لە باشور هاندان و زەمینە خۆش کردنە بۆ هاوکاری و هەماهەنگی کوردەکانی تری باکورو رۆژهەلات و رۆژئاوا ، تورکیاش وەك دەوولەتێکی داگیر کەر بەشێکی گەورەی کوردستانی لەژێر دەستدایە ، جگە لەمانەی باسم کرد تورکیا لەنێو خۆ دەرەوەش کەوتۆتە نێو کۆمەلێ گێژاوەی سیاس و ئابووری و ...... هتد لەلایەك سوپا تا ئێستە دەسەلاتی بەهێزترە لە حکومەت لەلایەکی تریشەوە فشارەکانی یەکێتی ئەوروپ ...

بەجینۆساید ناساندنی قەتل و عامی ( ئەرمەنەکان ) قەیرانەکانی قولتر کردۆتەوە , بۆیە لەگەل هاتنە پێشەوەو کۆکردنەوەی سوپای تورك بۆ سەر خاکی کوردستان هاولاتیان وەك هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانی رژانە سەر شەقامەکان و لە تەواوی شار و شارۆچکەکان خۆپێشاندانیان ئەنجام دا و دروشمی نەتەوایەتی و ئاشتی و برایەتی و بەرگری لە خاك خاکیان بەرزکردەوە .

خۆش بەختانە ئەمجارەشیان توێژی لاوان وَ گەنجان داینەمۆ و رێکخەری ئەم چالاکیە نەتەوایەتیە بوون و هەر ئەوانیش داکۆکی کارێکی سەر سەخت دەبن لە نیشتمان لە دژی هەر دەست درێژییەکی دوژمنان .

بۆیە گرنکە دەسەلاتی کوردستان ئەم هەلوێستە جوامێرانەی گەنجان بەرز بنرخێنێ و زمینەی باشتر برەخسێنێ بۆ خۆشگوزەرانی لاوان و هێنانەدی حەزو خولیاکانیان، چونکە ئەمجارەشیان لاوان هەموو کەم تەرخەمیەکانی حکومەتیان بەلاوە نا لەپێناو بەرگری کردن لە نیشتمان ئەمەش مانای ئەوەنیە لاوان بێ دەنگ بن لە بەرامبەر خواستەکانیان بەپێچەوانەوە لاوان هێزی سەرەکین بۆ گۆرانکاریەکان بەلام ناشیانەوێت هیچ گۆرانکاریەك بە خوێن رشتن بێت ، بەلکو بە دیالۆگ و دیموکراتیەت هەرچەندە ئەمجارەشیان شەر بەرۆکی نەتەوەکەمانی گرتووە بەبێ ئەوەی خواستی ئێمەی لەسەر بێت بۆیە گرنگە دەسەلاتی کوردستان جگە لەو چالاکیە جەماوەریانەی نێو کوردستان هەموو رێگایەکی دبلۆماسی بگرێتە بەر بۆ ئەوەی بەرگری لە خاکمان بکەین و تەمی شەری لێوە دوور کەینەوە و تورکیاش دان بەراستی و ژیان و بوونی نەتەوەی کورد بنێ وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ ، دەبێت تورکیاش لەوە دلنیابێت بەچەك ناتوانێت کێشەی رەوای میللەتێك وون بکات , چونکە هەموو کورد ئامادەیە تا دوا کەس بەرگری لە خاك و نیشتمان و نەتەوەکەی بکات لەپێناو مافی رەوای خۆی و یەکگرتنەوەی کوردستانی گەورە.

# شەڕی بەرژەوەندییەکان

لەدوای راپەڕین زەمینەیەکی فراوانتر هاتە ئاراوە بۆ زیاتر پڕۆڤەکردن و تێگەیشتن لەمانای کایە فیکرییەکان و بە دەیان حزب و رێکخراوی پیشەی و دیموکراتی هاتە ئاراوە ، کە ئەمەش جێگای دڵخۆش و هەنگاوی باشە بۆ گەلی کورد لە پێناو زیاتر خۆ رۆشنبیر و درێژە پێدانی خەباتی رزگاری نیشتمانی و دروست بوونی کیانێکی سەربەخۆ و دامەزراندنی حکومەتێکی فرە بیرو بۆچون و هاتنە کایەی سەرەتاکانی کۆمەڵگای مەدەنی( کەئێستا قسەی سەر زاری زۆربەی حزبەکانە)و پەیرەوکردنی چەمکی دیموکراتی بەهەموو ماناکانیەوە لە هەمان کاتدا کاری باشە کە ئێمەی کوردیش خاوەن بیرو رای جیا بین و هەمووومان وەك یەك بیرنەکەینەوە چونکە گەر هەمووومان وەك یەك بیر بکەینەوە لەمەسەلە فیکری و کاری سیاسی گومانی تیانیە لەهەموو کارەکان و بڕیارەکان تەنیا یەك روو دەبینـدریٚ کە ئەویش روە ئیجابیەکەیە و رۆژ بەرۆژیش کارە سلبیەکان زۆر و زۆرتر دەبێت تا بۆگەن دەکات ، بەڵام جگە لەو هەموو خەون و ئاواتانەی ئێمە هەمان بوو بۆ کۆمەڵگای مەدەنی و خاوەن کیانێکی سیاسی سەر بەخۆ نەهاتەدی ، ئەوا شەری خۆ کوژی و ململانێی تەسکی حزبایەتی و بەرژەوەندی تایبەت و قەبوڵ نەکردنی بیرو بۆچونی یەکتر و شێواندنی تەواوی مانا جوانەکانی دیموکراتی و بەرتەسکردنەوەی ئازادیە فیکریەکان ئەوا هەر حزبە و بەناوی تەواوی کوردەوە بانگەشە بۆ خواست و ئاواتەکانی ئەم گەلەدەکات کە رەنگە ئەمەش بەهەقی خۆی بزانیٚ کە پێیوایە ئەو حزبێکی نیشتمان پەروەر و خاوەن مێژوو دەیان داستانی بەرگری تۆمارکردوە ، بەڵام ئەبیٚ ئەم راستیە بزانین ئەم قۆناغە بەسەر چووە ، راستەکاتی خۆی بەتایبەتیش لەگەڵ

پێکهاتەی بەرەی کوردستانی لە ساڵی(١٩٨٨) خەڵکی بەبێ جیاوازی بیر و بۆچونی حزبایەتی سەیری شۆرشی پارتی زانی هەموو حزبەکانی دەکرد ، بەڵام لەگەڵ دەست پێ کردنی شەڕی برا کوژی لە(١٩٩٤) ئەو هاوکێشەیە پێچەوانە بۆوە و ململانێی تەسکی حزبایەتی و گرتنە دەستی دەسەڵاتی تاك رەوی کەوتە پێش بەرژەوەندی میللەت تاگەیشتە ئەو ئاستەی پەنا بەرنە بەر ئەو رژێمانەی کە گەلی کوردیان ئەنفال و کیمیا باران و خاك زەوت کردن و بەتاڵان بردن و...هتد ، هەرچەندە ئێستا ئاشتییەکی کاتی هەیە و بەداخەوەش زۆر سست و لەقاڵب دراوە و تائێستا ئێمە لە نێو خۆماندا کۆك نین بەتایبەتیش هەر دوو حزبی فەرمان رەوا ، بۆ هەڵقۆزتنەوەی ئەم هەڵە رژێمی فاشی بەعس ماوەماوە داوای وتوێژ لە هەردوو حزبەکە دەکات واتە وتوێژ لەمەڕ کێشەی سیاسی گەلی کورد ، هەرچەندە تائێستاش کێشەی گەلەکەمان نە لەلایەن نەتەوەیەکگرتوەکان وەنە لەلایەن رژێمی سەدام حسین بەکێشەیەکی سیاسی سەیر ناگرێ ، کەچی هەردوو حزبی سەرەکی وەك لەچاوپێکەوتن و لێدوانەکانیان و خۆشمان رۆژانە دەبینین لە نێو هەردوو ئیدارە دا پەیوەندی هەیە لەگەڵ رژێم بەتایبەتیش لە مەسەلەی بازرگانی و رۆشنبیری و وەرزشی و تەندروستی و .... ، بەڵام سەیرەکەی لەوە دایە وەك ساڵانی (١٩٧٠تا١٩٨٥)ی شۆرشی چەکداری هەر حزبە و دەیەوێ پەیوەندی خۆی بەهێزتر بکات لەگەڵ رژێم و بەتەنیا ئەو بە ردێن سپی و بەرپرسی کێشەی میللەتی کورد بزانێ کە گوایە ئەوان پێکهاتەیەکی حزبی فراوانن ، رەنگە ئەمە راستی تیابێ کە خاوەن هێز وحزبێکی فراوانن ، بەڵام دەبێ ئەوە بزانن ئەوە کێشەی نەتەوەیەکە نەك حزبێك .! لەگەڵ رێزم بۆ هەموو ئەندامێکی حزبەکان لەبەر چاومانە ئێستا هەرچی سەرکردایەتی حزبەکان بیڵێین ئەوا بێ یەك و دوو خوارەوە دەبێ جێبەجێ بکات و نابێ هیچ خیلافێکی هەبێ بەڵکو دەبێ کاری بۆ بکات (١٠٠٪) بۆیە بەهیچ شێوەیەك بەراست نازانم لەمەڕ وتوێژ لەگەڵ رژێم راو بۆ چونی جەماوەر وەرنەگیرێت ، چونکە هەموو حزبەکان بەتایبەتیش (یەکێتی و پارتی) رژێم باش

دەناسن ، بۆیە نابێ چارەنوسی گەلێك بخرێتە ژێر پێ ، چونكە گەلی كوردیش تەنیا بای ئەنفال وكیمیا باران كردن و كۆچ رەوێكی تری ماوە ، بەڵكو دەبێ لەو گۆڕانكارییە بە پەلانەی دنیا كە كێشەی كوردیش هەم دیسان هاتۆتەوە مەیدان دەتوانین هەنگاوی باشتر و حەكیمانەتر بهاوێژرێ ، چونكە لەدوای پەیمان نامەی (سیڤەر) لەساڵی(١٩٢٠) كێشەی گەلی كورد دوو جار زۆربەرونی دیار و بەرچاو بوە لەنێو وڵاتانی خور ئاوا ، جاری یەكەمیان كیمیا باران كردنی (هەڵەبجە)ی شەهید بوو كە بەداخەوە گەورەترین تاوان بوو لە جیهان لەدوای (هێرۆشیما و ناكازاكی) بەڵام چونكە شەڕی عێراق و ئێران لە بەرژەوەندی خۆرئاوا نەبوو هەر زوو تاوانی هەڵەبجە بێ دەنگ كرا ، دووەمیشیان راپەڕین و كۆچ رەوەكەی ١٩٩١ بوو كە بڕیاری (٦٨٨و پاراستنی هێڵی٣٦) بۆ قازانجی كورد لێ كەوتەوە ، بۆیە بەڕەوا نازاندرێ و قەبوڵ نیە تاكە حزبێك بەناوی هەموو گەلی كوردەوە هەق بەخۆی بدات بچێتە گفتوگۆ ، لە كاتێكدا سات بە سات ئەگەری لێدانی گورزی سەربازی بۆ سەر رژێم نزیكتر بۆتەوە ، ناشبێ ئەم دوو حزبە كە سەرباری ئەو هەموو ئێش و ئازارەی بەسەر ئەم میللەتەیان داهێناوە بەتایبەتیش لەشەڕی براكوژی و حزبایەتی تەسك بچنە نێو ئەو یاریە ترسناكە وەك چۆن لەگەرمەی شەڕی ئەفغانستان رژێمی بەعس سەفارەتی (برهان الدین رەیانی) كەلە بەغدا بوو بەلاوەناو دانی بە حكومەتی تاڵیبان دانا كە پێچەوانەی هەموو وڵاتانی ئیسلامی و عەرەبی بوو كە حكومەتی تاڵیبانیان بەناوی هاوكاری تیرۆرستان لە روداوەكەی ٢٠٠١/٩/١١ی سێ شەممەی رەشی ئەمریكا تاوان باركرد ، بۆیە تائێستاش خەڵكی كورد ئومێدێكی بەكێشەی میللەتەكەو ئەو دوو حزبەش ماوە و دەبێ چاودروانی گۆڕان كارییەكان بین و بتوانین لەبەرژەوەندی خۆماندا هەوڵی (ریفراندۆم)ێك بدەین بەسەرپەرشتی نەتەوەیەكگرتوەكان جا بۆ (سەربەخۆیی یا كۆن فیدراڵی یا فیدراڵی)بێ و ئێمەش بە (ریفراندۆم)ێكی سیاسی وەك جیا بونەوەی (نەریتریا لە ئەسیوبیا)و (تەیموری رۆژهەلات لە ئەندەنوسیا) بگەینە ئامانج .

# کێ لە کانە نەوتییەکانی مەخمور سوودمەند دەبێت

مەخمور یەکێکە لە قەزاکانی سەر بەشاری هەولێر و نزیکەی (٦٥) کیلۆمەتر لەو شارەوە دوورە ، ئەم شارە لەبەر گەورە بوون و بەرفراوانی ناوچەکە لەساڵی ۱۹۲۷ کراوە بە (قەزا) وەك ناوەندێك بۆ بەیەك گەیاندنی هەرسێ ناحیەکەی (قەراج،گوێر،دیبەگە) ئەم قەزایە هەر لەکۆنەوە زێدی کوردان بووە و هەندێ ماڵە (جوولەکەش)ی تیادا ژیاوە و لە ساڵانی چلەکانی ئەم سەدەیەوە کۆچیان پێکراوە بۆ (ئیسرائیل)، یەکەم ماڵە (عەرەب)یش کە هاتۆتە شاری مەخمور ماڵی (ئەحمەد) عەرەب بووە لە شەستەکانی ئەم سەدەیە.

قەزای مەخمور لە رووی ئابوورییەوە سنورەکەی تایبەتمەندی و بایەخێکی گرانبەهای لە خۆگرتووە چونکە خاوەنی زەوی و زارێکی بەپیتی کشتوکاڵییە بەتایبەتیش بەرووبومی دانەوێڵەی (گەنم وجۆ)، لە چوار وەرزی ساڵیشدا پاوەنێکی هەمیشەیی مەڕوماڵات بە خێوکردنە ، جگە لەمانەش سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی جۆرەها کانزای وەك (نەوتی خاو و گەچ و گۆگرد و مەڕمەڕ ...هتد) .

هەربۆیە رژێمی بەعسی رووخاو کارگەیەکی گەچ و سایلۆیەکی گەورەی بۆ عەمبارکردنی گەنم و جۆ لە مەخموور دروستکرد کە ئەم سایلۆیەش بە دووەمین سایلۆ دادەندرێ لە رووی گەورەی قەبارەوە لەسەر ئاستی هەموو ئێراقدا .

هەرچی بایەخی نەوتی ژێر زەویشە ئەوا رژێمی رووخاو گرنگیەکی ئەوتۆی پێنەداوو لەرووی دامەزراندی کارگە و (پاڵاوگەی نەوتی) چونکە لەوە دڵنیا بووە لەو ناوچەیە هەر گۆرانکاریەکی سیاسی رووبدات ئەوا لە بەرژەوەندی ئەو نابێت بۆیە لەم رووەوە زۆر گرنگی پێنەداوە ، بەڵام لەهەمانکاتدا زۆربەی بیرە نەوتەکانی بەبۆری بە (پاڵاوگەی کەرکوك)ەوە بەستاوەتەوە .

ئەگەر بە خێرایش تیشك بخەینە سەر ئەو کانە نەوتیانە کە تائێستا بەرچاون لەم ناوچەیە بەم شێوەیە، لە گوندی(سەربەشاخ)(٢٠) چاڵە نەوت هەیە ، لەگوندی بناری (زورگەزراو)یش وەك گوندی (پەرکانەو جاستان) نەوتێکی ئێجگار زۆری لێیەو سالانە رژێمی بەعس بەهۆی بۆری گەلێکەوە بەکۆمپانیای(بای حەسەن)ی بەستۆتەوە، هەر لەژێر (زورگەزراو) حەوزێکی دیکە هەیە کە بریتیە لە(١٨) چاڵە نەوت ، ئەگەر سەیرێکی چیای (قەرەچوغ)یش بکەین ئەوا ژێرەوەی ئەم چیایە بە دەریای نەوت ناوزەندەکراوەو یەدەکی نەوتەکەی هیچی لە (بابەگوڕگوڕ) کەمترنیە و بەرهەمی خەملێندراوی رۆژانەی دەگاتە (٧٠٠٠) بەرمیل، هەر لە گوندی (سەرگەڕان)و دەوروبەری نزیکەی(٤٠) چاڵە نەوت هەیە کە بەم دواییە رژێمی رووخاو ئەم گوندەی خستە سەر ئیدارەی قەزای دوبز (دبس) جگە لە دەیان و سەدان بیری دی کە سەریان داخراوە وەك ئەو بیرانەی لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا لە نێوان گوندی (لهێبان وسێ قوچان) و دەرماناوە)دۆزرانەوە .

هەرچەندە ئێستا قەزای مەخمور بە هەر سێ ناحیەکەیەوە لەرووی ئیداری سەدا سەد لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا نیە ، بەلام بۆ ئایندەی کوردستان دەبێتە کۆڵەکەیەکی ئابووری و دەرامەتی دەوڵەت و عەمباری لەبن نەهاتووی سامانی نەتەوایەتیمان کە کورد تەنیا لە دەشتی (کەندێناوە) بارتەقای یەك لە ولاتانی کەنداوی عەرەبی نەوتی هەیە ، بۆیە رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی ئێراق چاویان بڕیوەتە ئەم پارچەیەو هەموو کات هەوڵی ئەومیانداوە پاکتاوی نەژادی لەم ناوچەیەدا ئەنجام بدەن و بەپرۆسەی (تەعریب و تەرحیل) ناوچەکە بکەنە ناوچەیەکی عەرەبنشین ، رژێمی فاشی روخاوی بەعس هەر لەگەڵ هاتنە سەر حوکم بەرنامە و پیلانی دارشت بۆ قەتل و عام کردنی نەتەوەی کورد و هاندانی عەرەبەکان بۆ تالانی کوردان و کورد کوژی بەتایبەتیش خێڵە عەرەبەکانی سنوری ئەم قەزایە ، بۆیە چەندین جار ئەم ناوچەیە بەر شالاوی تالان و کورد کوشتن بۆتەوە و دوایین جاریش کە بەپلانێکی تۆکمەوە کاری بۆ کرد لە کۆتایی ساڵی

١٩٨٧ بوو كاتێ پرۆسەی ئەنفال و عریب و تەرحیل و تەبعیس دەستی پێكردەوە و بە چەندین شێواز فشاریان خستە سەر دانیشتوانی ناوچەكە و تەواوی گوندەكانیان تێكدراو ناحیەی دیبەگەش بەتەواوی تەرحیلی ئۆردوگای زۆرەملێی خەبات(كەڵەك) كردو تەواوی خانووەكانیش دابەشكرا بەسەر ماڵە عەرەبەكان بە هەمان شێوە فشاری بۆ كوردەكانی ناحیەی (قەراج و گوێر) هێناو زۆر بەی كوردەكانی بۆ هەولێر و مەخموور دەركردو رێژەی عەرەبی لەهەردوو ناحیەكەش زیادكرد ، ئەم پرۆسەیە ناو قەزاكەش كە مەخمورە بێبەش نەكردو چەندین خانوی كوردانی روخان بە بیانوی ئەوەی كوڕەكانیان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی كوردستانە ، رق و كینەی بەعسیە فاشیەكان تادەهات بەرامبەر بە كورد زیادی دەكرد و لەهەمان كاتدا گیانی تۆڵەكردنەوە و خۆراگری و رق و كینەی كوردانیش بەرامبەر بە جەورو ستەمی بەعسییەكان لەزیاد بوندابوو ، بۆیە لەراپەڕینە مەزنەكەی (١٩٩١) مەخموریش لە ١٩٩١/٣/١٢ بۆ ماوەی(٢٠) رۆژ رزگاری بەخۆوە بینی و تەواوی دام ودەزگاكانی بەعس لەم شارەدا سوتێندراو بارەگای هێزی پێشمەرگەی كوردستانی تێدا كرایەوە .

بەداخەوە لەگەڵ شكست هێنانی راپەڕین و گەڕانەوەی رژێمی فاشی بەعس بۆ كوردستان و دانای هێڵی (٣٦) لەلایەن هاوپەیمانانەوە و بەرنەكەوتنی قەزای مەخمور بۆ ناو ئەم هێڵە دەسەڵاتدارانی رژێم ئەمجارەیان لە جاران دڕندانەتر كەوتنە ئازار دان و ئاوارەكردنی دانیشتوانی ئەم ناوچەیەو تەواوی زەوی و زارەكانی بەسەر خێڵە عەرەبەكاندا دابەشكرد بەمەبەستی گۆڕینی بیلۆگرافیای ناوچەكە ناوی سەرجەم گوندە كوردییەكانی گۆری ناوی عەرەبی لێنان و كوردەكانی ناو قەزاكەشی بێبەش كرد لە خزمەتگوزاریەكان و فشاری بۆ دەهێنان كە نابێت ناوی كوردی لە منداڵەكانیان بنێن و ئەگەر ناسنامەكانییان نەكەنە عەرەبی ئەوا زەوی و خانوو ئۆتۆمبێل ...هتد، بە ناویان ناكرێت و ئەوانەی مامۆستا و فەرمانبەریشن دەیان گوازێتەوە خوارووی ئێراق ! هەر لە درێژەی ئەم كارە چەپەڵانەی بەعس لە ساڵی (١٩٩٦) بەبریارێكی مەجلیسی قیادەی شاری مەخموری خستە سەر ئیدارەی

شاری (موسڵ) لە کاتێکدا ئەم قەزایە لە ساڵی (١٩٢٧) کە کراوەتە قەزا سەر بە پارێزگای هەولێرە .

بەداخەوە ئەم کێشەیە تائێستاش کە ماوەی (٦) ساڵە تەواوی ئێراق رزگار کرایەوە چەند حکومەتێکیش ئالوگۆڕ کرایەوە کەچی تائێستا سەرکردەکانی کورد نەیانتوانیوە بە دیالۆگ و هەر فشارێکی دیکە ئەم قەزایە بگرێتەوە سەر پارێزگای هەولێر ، بۆیە دەبێت سەرکردایەتی کورد ئەم راستییە بزانێت ئەم بڕیارەی رژێمی فاشی رووخاوی بەعس و هەڵنەوەشاندنەوەی ئەم بڕیارە لەلایەن حکومەتی ناوەندی ئێستا لەبەر کورد بوون و کورد نەبوونی قەزاکەو ناوچەکە نیە ! بەڵکو لەئێمە باشتر ئەزانن کە بایەخی ئابووری بەتایبەتیش (کانە نەوتیەکان)ی ئەم ناوچەیە چیە و چ رەنگدانەویەکی دەبێت لەداهاتوو بۆ دروست بوونی کیانێکی سەربەخۆی کورد و بەهێز تربوونی پێگەی نەتەوایەتی و نیشتمانی کورد لەسەر ئاستی ناوچەی رۆژهەڵات و جیهان بەگشتی .

لەهەمان کاتدا ئەگەر ئێستا سەیری ناو پێکهاتەی حکومەتی ئێراق بکەین ئاماژە بەوە دەدات کە (ئێراق دەوڵەتێکی فیدرالیە)و لەسەر بنەمای پێکەوە ژیان و ئارەزوومەندانەی چەند نەتەوەیەك بنیادنراوە کە (عەرەب و کورد) بەشێکی سەرەکی بن لەدەسەڵات و پێکهاتەی ئیداری و ئابووری لەهەمان کاتدا ئاماژە بەوە دراوە کە هەرێمی کوردستان تایبەتمەندی خۆی هەیە و هەر کاتێکیش (٣) پارێزگای دیکە توانیان خۆیان رێکخەن دەتوانن وەك دەسەڵاتێك بانگەشەی هەرێمێکی جیا بکەن وەك هەرێمی کوردستان و ئەم هەرێمانەش لە نێو وڵاتێکدا بەیەکەوە دەژین و ئەرك ومافیان دیاری دەکرێت لە چوارچێوەی یاساو دەستووری ئێراقی فیداڵ ، بەڵام سەیر لەوەدایە لەو وڵاتانەی پەیڕەوی سیستەمی فیدراڵی دەکەن یان وڵاتەکەیان لەچەند هەرێمێکی دیاری کراو پێکدێت ئەوا پەیڕەوی ئەو یاسایە دەکەن کە خۆیان دایان رشتووە لەبارەی ماف و ئەرکی هاوڵاتیانی ئەو هەرێمە ، بەتایبەتیش لەرووی ئابووری واتە یاساکانیان ئاماژە بەوە دەدات بایەخی ئابووری سەرزەوی و ژێرزەوی

هەرێمێك لەكاتی دەرهێنان و فرۆشتنی وەك ئابووری دەوڵەت بۆ قۆناغی (بازرگانی دەرەكی) ئەوا پێویستە بەپلەی یەكەم بڕی ئەو داهاتە بۆ ئەوشارە و ئەو هەرێمە بێت كە ماددەكەی لێ دەردەهێندرێت بۆ گەشەكردنی ژیانی كۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاریەكان ! كەچی بەداخەوە لەولاتی ئێمەدا نزیكەی سەدەیەكە بەپارەی ئەم نەوتە بەچەك پاداشتی ئێمە دەدەنەوە و جینۆسایدمان دەكەن ! بۆیە جێگای پرس و گومانە ئایا بۆچی حكومەتی ناوەند كەلەسەر بنەمای (فیدرالی) دامەزراوە ئامادەنیە دان بەم راستیە دابنێ و سەركردایەتی كوردیش لەوان سارتر كەمتەرخەمن لەمەر گەڕانەوەی قەزای مەخموور لە كاتێكدا كورد تەنیا لە مەخموور بارتەقای ولاتێكی كەنداو نەوتی هەیە ، كەچی ئەم سنوورە تائێستا لە بچوكترین خزمەتگوزاری بێبەشە كە ئاوی خواردنەوە و كارەبا و تەندروستیە . بۆیە جێگای پرسیار و رامانە ئایا لە ئێستاو ئایندەدا كێ سوودمەند دەبێت لە كانە نەوتیەكانی مەخمور .

* بۆ زانیاری وەرگرتن لەسەر ژمارەی كانە نەوتیەكان سودم لە بابەتێكی بەڕێز (جەلال سنجاوی) وەرگرتووە كە لە ژمارە(٣١٤٤)ی رۆژنامەی برایەتی بلاوكراوەتەوە.

# بۆ مەخمور و مەخمورییەکان

**دەنگت ئایندەیە**

**کارەبات بە دەقەیە**

**ئاوت بە قەترەیە**

**نەوتت بە دەبەیە!**

پرۆسەی هەڵبژاردن یەکێکە لە بنەما هەرە جوان و سەرنج ڕاکێشەکانی چەمکی دیموکراتییەت! چونکە دیموکراتییەت بەبێ ئەنجام نەدانی هەڵبژاردن لە نێوەندەکانی ئیداری و سەندیکاو ڕێکخراوو حزب و پەرلەمان....مانا ڕاستەقینەکەی خۆی ون دەکات، لە وڵاتانی دیموکراسی خەڵك حکومەت دروست دەکات هەر ئەویش دەتوانێت بیڕوخێنێ ئەگەر ئەو حکومەتە نەیتوانی بەڵێنەکانی پێش هەڵبژاردن کەبەهاوڵاتیانی داوە دوای هەڵبژاردن جێ بەجێ بکات، یان ژیانی هاوڵاتیان باشتر بکات ئەویش بە ئاڵوگۆڕی دەسەڵات بە شێوەیەکی دیموکراتیانە کە هەڵبژاردنە! خۆشبەختانە ئەگەر بەکرچووکاڵیش بێت چەند ساڵێکە ئەم پرۆسەیە لە کوردستان و عێراقیش بەڕێوە دەچێت، بەڵام لە فەرهەنگی ئێمە ماناندا گرنگ زۆرینەی دەنگ و کورسیە بە هەر شێوەیەك بێت نەك ئامانجە سەرەکییەکەی ئەم پرۆسەیە کە بریتیە لە هۆشیاری تاکەکان و باشترکرنی ژیانی هاوڵاتیان! هەڵبژاردنی ئەمجارەی ئەنجومەنی پارێزگاکانی عێراق کە لە ٣١ /١ /٢٠٠٩ بەڕێوەچوو چەند دیاردەیەکی ناشرینی تیا بەدی کرا لە کڕین و فرۆشتنی دەنگ و بەکارهێنانی دەسەڵات و پارەی دەوڵەت بۆ مەبەستی تایبەت، کە بووە هۆی دڵەڕاوکێ و بێ ئومێدی دیموکراتیەتخوازان و لەوە دەترسن بەناوی دیموکراتییەتەوە دیکتاتۆری تری مەزهەبی و قەومی دروست بێت.

لەم پرۆسەیەدا کەم و زۆر کوردیش کەوتە نێو ئەم یارییەوە بە تایبەتیش لەسنوری پارێزگای (نەینەوا – موسڵ)دا، سەیر لەوەدایە بە درێژایی مێژووی بزوتنەوەی سیاسی کورد لە سەدەی (بیست)دا قسەیەکی ئەوتۆو گرنگ نەوتراوە لەمەڕ کوردستانی بوونی (موسڵ) کەچی ئەمجارەیان هەنگاوەکانمان چڕتر دەکردەوە بۆ بەڕێوەبردنی شاری (موسڵ) لەرووی ئیدارییەوە ! لەکاتێکدا هێشتا بە پێی پێویست کێشەی خزمەتگوزاریو بێکاریو نیشتەجێو... (هەولێرو دهۆكو سلێمانی) چارەسەر نەکراوە ! من گومانم لەوەدا نیە کە موسڵیش لەرابردوودا بەشێك بووە لەسنوری دەسەڵاتی میرنشینەکانی کورد دوای لاواز بونی دەسەڵاتی خەلافەتی عوسمانی ! بەڵام مانای ئەوە نییە لە رۆژگارێکی وەك ئەمڕۆدا کە شارەکە هەم لەرووی ئەمنی هەم لەرووی سیاسییەوە لەبارنییەو جگەلە تیرۆرستانو بەعسییە فاشیەکانو فشاری وڵاتی ئیقلیمی ئەوا حکومەتی ناوەندیش بەشێکی گەورەیە لەم کێشەیە، هەر لەهەڵبژاردنی رابردووی (نەینەوا) پێگەی ئیداری کورد نیوەی کورسییەکانی ئەنجومەن زیاتر بوو، کەچی تیرۆری کورد کوژیو ئاوارە بونی کوردان زیاتر بوو ! لە هەمان کاتدا نەیانتوانیوە پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری بەرچاو لەو شوێنانە ئەنجام بدەن کە رێژەی کوردی تیا زیاترە، کەچی ئەمجارەیان سەرکردایەتی کورد گوایە بۆ تەوازنی سیاسی خۆی لە ئیدارەکە چەند تاکتیکێك بەکار دەهێنێ بەتایبەتیش کارتی کوردە ئاوارەکانی دوای دانانی هێڵی (٣٦). کە مەخمورو شێخان... دەگرێتەوە واتە ئەو شوێنانەی رژێمی رووخاوی بەعس لەساڵی (١٩٩٦) بە بڕیارێکی مەجلسی قیادی دەستکاری سنوری جوگرافی شارەکانی کردو هەندێ شوێنی سەر بە پارێزگای (هەولێرو دهۆك)ی خستە سەر ئیدارەی شاری (موسڵ) بەداخەوە سەرکردایەتی کورد لە شوێنی ئەوەی بەردەوام بێت بۆ فشار خستنەسەر حکومەتی ناوەند تا بڕیارەکانی بەعس هەڵوەشێنێتەوە ! فشاری خستە سەر ئەو خێزانانەی کە مامەڵەی بڕیاری ماددەی (١٤٠) یان کردبوو وەك قەرەبوونەوەیەکی زیانەکانی رابردوویان، ئامانجی ئەم کارەش بەهێزکردنی لیستی (برایەتی نەینەوا) بوو !

كەچی بە فشاری كۆنە بەعسییەكان و حكومەتی ناوەند كۆمیسۆنی باڵای هەڵبژاردنەكان لەعێراق قبوڵی ئەوەی نەكرد ئەو خێزانانەی فۆرمی قەرەبوی مادەی (١٤٠)یان پركردبۆوە بەشداری ئەم دەنگدانە بكەن كە زیاتر لە (٢٠٠٠٠) بیست هەزار خێزان بوو، ئەگەر لە هەر خێزانێكدا (٣) كەس هەقی دەنگدانی هەبێت سنورەكەمان ئەندام پەرلەمانێكی دەبێت لە پەرلەمانی عێراق و كوردستانیش ! بە گوێرەی زانیارییەكانی من و خوێندنەوەی بڕیارەكانی كۆمیسۆنی باڵای هەڵبژاردنەكان زەحمەتە ئەو خێزانانەی مامەڵەی ماددەی (١٤٠) یان كردوە، واتە فۆرمی خۆراكیان گەڕاوەتەوە سەر ئیدارەی (موسڵ و كەركوك و سەلاحەدین) بتوانن بەشداری هەڵبژاردنەكانی داهاتووی كوردستان بكەن ! واتە ئەو كەسانە ماف خۆ پاڵاوتن و دەنگدانیان نییە بۆ پۆستەكانی ئەنجومەنی پارێزگاكانی (هەولێر و دهۆك و سلێمانی) و پەرلەمانی كوردستان. كوردەواری وتەنی: (لە كۆتریش بووین لە قەلیش بووین) لە هەمان كاتدا دڵە راوكێیەكی زۆر لەنێو ئەو خەڵكە بلاوبۆتەوە كە گوایە لە داهاتوودا منداڵەكانیان لە قوتابخانەكانی هەولێر وەرناگیرێ و شوێنی ئیداری فەرمانبەران و مامۆستایان و موچە خۆرانی حكومەتی هەرێم واتە ئەوانەی لە هەولێر دادەنیشن و فۆرمی قەرەبوی ماددەی (١٤٠)یان پركردۆتەوە دەخرێتە سەر ئیدارەی (موسڵ) لەهەمووش سەیرتر ئەوەیە ئێستا لە ئیدارەی هەولێر بە تایبەتی بەڕێوەبەرایەتیەكانی (پۆلیسی هاتووچۆ و تاپۆ و ئاسایش) هیچ مامەڵەیەك بۆ ئەو كوردانە راناپەڕێنن گوایە فۆرمی خۆراكمان و ناسنامەمان (موسڵ)ە واتە ئێمە بە شاهیدو كەفیلیش ناچین لەلای ئاسایش و ناتوانین لە تاپۆ خانوو زەوی بەناوی خۆمان بكەین و ناتوانین لە پۆلیسی هاتووچۆ مامەڵەی ئۆتۆمبێل و مۆڵەتی شۆفێری و كۆبۆنی بەنزین دەركەین ! كەچی لە هەڵمەتی هەڵبژاردن ئەنجومەنی (موسڵ) بە ئێمەیان دەوت ئێوە (عەیار ٢٤) واتە هانیان دەداین كە لە هەولێرەوە بچینە مەخمور بۆ دەنگ دان، ئەمە سەرباری ئەوەی زۆربەی خێزانەكان زەحمەتێكی زۆر دەكێشن بۆ هێنانەوەی خۆراكی مانگانە، هەندێ خێزان هەیە ئەمە

(٤) مانگە خۆراکی وەرنەگرتووەو ناویشی نەگەڕاوەتەوە یان کەوتۆتە شوێنێکی دوورە دەست و لای گوندە عەرەبەکان ! جیاوازییەکی گەورەتریش ئەوەیە ئێمە لەهەولێرلە بڕی خۆراکی (٦) سەر خێزان مانگانە (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد دینارمان دەدایە بریکارەکە، کەچی لە مەخمور (١٤,٥٠٠) چواردە هەزارو پێنج سەد دینار وەردەگرن گوایە بە زەحمەت لە (موسڵ)ەوە خۆراکەکە دەگاتە مەخمور لەلایەکی ترەوە گرنگ بوو بۆ حزبەکانی سنوری مەخمور بە تایبەتیش پارتی و یەکێتی بە راوێژکردن لەگەڵ خەڵکانی دڵسۆز و بێ لایەن تەنیا یەك نوێنەریان دەست نیشان بکردایە بۆ ئەوەی بێ مەرج ڕێژەی دەنگەکانی بهێنایە. نوێنەرێکی راستەقینەو داکۆکی کارێکی سەر سەخت بوایە بۆ خزمەتکردنی سنورەکە و گەیاندنی خواستی مەخمورییەکان بە ئەنجومەنی پارێزگا ! چونکە تا ئێستا مەخمور بە بڕو بیانوی نا دروست کەوتۆتە نێو بەرداشی دوو ئیدارەیی و نەبوونی نوێنەری خۆشی لە هەردوو ئیدارەکە مەخمور لە گوندێکی گەورە دەچێت نەك قەزایەك.

# تەنها سیستەمی سۆسیالیزم

گــەورە بیرمەنــدی مرۆڤایــەتی ( کــارل مــارکس ) کــە بەداریــژەری بیروبــاوەری مارکسیەت دادەنرێت ، کاتێك وەك بیردۆزێك زێدەبایی لە سیستەمی سەرمایەداری دیاری کرد ، سەلماندی کە تەنیا هێز و بازووی کرێکار بەفیرۆ ئەڕۆیشت بەبێ ئەوەی کرێکارەکە بەورادەیە هەستی پێبکات کە هێزی ئەو کەسێکی خاوەن پارە دەکات بە سەرمایەدارێکی گەورە و خاوەن دەیان کارگەی جۆراو جۆر و کۆشك و تەلاو پارەی زێدەی خەوتوو لە بانکەکان ! هەر ئەو فکرە مەزنەش بوو ملیۆنەها کرێکاری زەحمەتکێش و هەژاری هۆشیار کردەوە هێنانیە مەیدانی خەبات و تێکۆشانی چینایەتی بۆ ئەوەی تەنیا لەپێناو دەست کەوتنی کار و دەر نەکردنیان لە کارگەکان کارنەکەن بەڵکو داوای مافی خۆیان بکەن هەر لە کەم کردنەوەی کاتی (سەعاتی) کارکردن زەمانەت و زیاد کردنی کرێ ی کارو پێداویستیەکانی تر، بۆ ئەم مەبەستەش بەدەیان جار مانگرتن و خۆپێشاندان و شەهیدیان دا تا خاوەن کارگەو سەرمایەدارەکانیان ناچار کرد لەبەر بەرژەوەندی خۆیان زۆربەی داواکانی کرێکاران قبول بکەن ، لەهەمان کاتدا هەر ئەم بیرمەزنە چینی پرۆلیتاریای هۆشیار کردەوە بۆ ئەوەی لە بەرامبەر دەسەلات داوای مافی خۆیان بکەن و قسە لەسەر داهاتووی خۆیان و نەوەکانیان و وولات بکەن ئەم فەیلەسووفە گەورەیە ( مارکس ) دەڵێ (لەهەر کۆمەڵگایەك ئەگەر ژێرخانت گۆری سەر خان بۆخۆی دەگۆردرێت ) واتە هەر کاتێ ( ژێرخان ) ئابووری دەولەتت بەشێوەیەکی یەکسانیانە وە لە خزمەتی کۆمەل سەرف بکرێت و هەول بدرێت بەم ئابووریە دەولەت ببوژێتەوە و پێداویستیەکانی خەلك دەستەبەر بکرێت و پرۆژەی خزمەت گوزاری جۆراو جۆری پێ ئەنجام بدرێت و قازانجی ئەم پرۆژانەش دووبارە بگەرێتەوە خەزێنەی دەولەت نەك گیرفانی بەرپرسان و سەرمەیەداران ، ئەوا بەم شێوەیە کۆمەلگایەکی سەر کەوتوو بنیاد دەنێیت و خەلکی نیشتمانەکەی لەلا خۆشەویس دەبێ ،

کاتێکیش ژێرخان بەم شێوەیەی سەرەوە ئال و گۆڕ بکرێت ئەوا گومانی تیانیە ژیانی تاکەکان باشتر دەبێ و هاولاتیان هەوڵی ئەوە دەدەن پلەکانی خوێندن تەواو کەن و خۆیان رۆشنبیر کەن و پەرە بە بەهرە هونەریەکانیان بدەن و هۆشیارانە مامەلە لەگەل گرفتە کۆمەلایەتیەکان و دین و سیاسەت بکەن ئەمەش بەمانای گۆرانی سەر خان دێت واتە هەر کاتێ ژێرخان بەباشی لە خزمەتی مرۆڤەکان بوو ئاستی سەر خان بەرز دەبێتەوە! کەچی لە کۆتایی سالی ۲۰۰۹ ( بانکی مۆن ) سکرتێری گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لە وتەیەکی کۆنفراسی سالانەی ( رێکخراوی خۆراکی جیهانی ) کە لە شاری ( رۆما ) لەپایتەختی ئیتالیا ئەنجامدرا ئاماژەی بەوەدا (یەك ملیارد ) مرۆڤ لە سەران سەری جیهان برسیانە و سالانە ( شەش ملیۆن ) مندال لەجیهان لەبرسان دەمرن و رۆژانەش (۱۷ هەزار ) مندال لەجیهاندا بەهۆی برسیتیەوە دەمرن بۆیە ئەگەر بتەوێت لەرووی ئابووری و سیاسی و رۆشەنبیری پێگەی هەر وولاتێك بناسی پێویستە سەرەتا خوێندنەوەیەکت هەبێ بۆ ( ژێرخان و سەرخانی ) چونکە ئەرکە لەسەر دەسەلات کە پلانی تۆکمەی هەبێت بۆ بەرز کردنەوەی (ژێر خان ) باری ئابووری وولات بۆ ئەوەی توشی داروخان نەیەت لەهەما ن کاتدا پێویستە داهاتی وولات چ لەرووی داهێنانی مادە خاوەکانی ژێر زەوی و سەر زەوی چ لەرووی گومرگ و باجە نێو خۆیەکاندا هاولاتیانی پێ ئاگادار بکرێتەوە لە چۆنیەتی سەرف کردنی ، بەلام لەکوردستانەکەی ئێمە لەسالی (۱۹۹۲) وەوە کەس نازانێت داهاتی ئەو هەموو باج و سەرانە و گومرگ و ئەو رێژمیەی حکومەتی ناوەند دیاری کردوە بۆ هەرێمی کوردستان چۆن دابەش دەکری و چۆن سەرف دەکرێ چونکە رۆژ بەرۆژ خەمی هاولاتیان لەرووی ئابووری و نیشتەجێ بوون و خزمەتگوزاری یەکان لەزیاد بوون دایە بۆیە دەبێت هەموو هاولاتیەکی کوردستان و جیهان ئەم راستیە بزانێت تەنیا سیستەمی هاوبەش ( سۆسیالیزم ) لە ژێر دەستەیی و برسیەتی رزگارمان دەکات و پەرە بە ئازادی و یەکسانی و خۆش گوزەرانی دەدات و ژیان جوانتر و گەشاوەتر دەکات .

# با بەزانست ولاتەکەمان ببوژێنینەوە

خوێندەواری و تەواوکردنی قوناغەکانی خوێندن تەنیا سود بەخش نیە بۆ خودی تاکەکە ، بەلکو زۆر سودمەندترە بۆ کۆمەڵو لە دەیان کێشەو گیروگرفت و دواکەوتوویی رزگاریان دەکات ،چونکە بەبیرکردنەوە و تێگەیشتن و لێکۆلینەوەی زانستی دەگەینە ئەنجامێکی گونجاو کاتێکیش تۆدەگەیتە ئەنجامی راست و دروست کە لەرووی خوێندن و زانستەوە لە لوتکە دابی واتە زەحمەتە کەسێکی نەخوێندەوار یان خوێندەوارێکی ئاسایی وەك فەلەك ناسێك یان زانایەکی بوواری کیمیاو فیزیاو پزیشکێك یا ئەندازیارێك بیربکاتەوە و لەپراکتیکیش دا وەك ئەوان بێت، هەر بەبیرکردنەوە و تاقیکردنەوەی خودی مرۆڤەکان ئەمرۆ زانست و تەکنەلۆژیا لەوپەری پێشکەوتندایە، ناشکرێ تۆ ئەم سەرکەوتنە گەورانەی لەبوواری زانست نەبەستیتەوە بەپشتگیری حکومەت و پێشکەوتنی ئاستی هۆشیاری تاکەکانی ئەو ولاتانە ،

خۆش بەختانە چەند سالێکە حکومەتی هەرێمی کوردستانیش پەرەی بە بوواری خوێندن داوە بەلام ئەوەی جێگەی نیگەرانی بێت هەست دەکرێ بەشێك لەپرۆسەکە خەریکە بەلاوازی و کەم تەرخەمی بەرێوەدەچێت بەتایبەتی گۆرینی مەنهەجی قوناغی خوێندنی سەرتایی زۆر ووشکەو بەزەحمەت مندالەکانمان لێ ی تێدەگەن لەهەمان کاتدا خودی مامۆستاکانیش گلەی لەوەدەکەن بابەتەکە وشك و گرانە بۆ تێگەیشتن لێیان نموونەش ئەوەیە بەشێکی مامۆستاکان سەرە دەری لە شێوازی شیکاری پرسیارەکان ناکەن بۆیە زۆربەی پرسیارەکان بۆ قوتابیان شیکارناکەن یان دەڵێنە قوتابیەکان لە پرسیاری ئەوەندە بۆ پرسیاری ئەوەندە لەماڵەوە شیکار بکەن

ئەم قسەیە لەماوەی ساڵێك دەیان جار بۆ قوتابیەکان دووبارە بۆتەوە دوای چەند رۆژێکیش کە سەیری پرسیارەکانم کردوە مامۆستای بابەتەکەش بۆ قوتابیەکانی شیکار نەکردووە راستە قسە لەسەر ئەوە هەیە ( کەوتن ) نیە تا پۆلی سێیەمی سەرەتایی بەلام ئەمە مانای وانیە تۆ ئەو وانە گرانانە بە قوتابی بلێیت و هیچیش تێنەگەن و نەبێتە بنەمایەك بۆ قوتابیەکە ،

لەلایەکی تر کردنەوەی ئەم هەموو کۆلیژ و زانکۆیە ئەهلیە کارێکی باشە بۆ ئەو خوێندکارانەی لە خوێندن دابراون جا بەهەر هۆیەك بێت و ئێستا گەراونەتەوە خوێندن بەلام لە هەمان کاتدا رەنگدانەوەیەکی نیگەتیفیشی هەیە چونکە هەندێ قوتابی نمرەکانی بەپێ ی پێویست نیە بەلام لە باشترین کۆلیژ وەردەگیرێ لەبەر ئەوەی مەرجی کۆلیژەکە بەپلەی یەکەم دانی ئەو برە پارە زۆرەیە لەبری سالانەی خوێندن چونکە بۆ تەواوکردنی کۆلێژی پزیشکی یان ئەندازیاری بۆ ماوەی چوار سال دەبێ ( ٢٥,٠٠٠,٠٠٠ ) بیست و پێنج ملیۆن دینار بدەیت لە هەند ێك لەو کۆلیژە ئەهلیانە ،

بۆیە خوێندن لەم کۆلیژانە خەونێکە بۆ ئەو خوێندکارانەی هەژاری و گرفتەکانی رۆژگار وای لێکردوون نمرەی باش بەدەست نەهێنن و لە خوێندن دواکەون لەهەمان کاتیش نیگەرانی زۆریش لەوەدا هەیە کە حکومەت بە یەك چاو سەیری هەموو قوتابیەکی خوێندنی بەیانیان و ئێواران ناکات چونکە خوێندکارانی بەیانیان مانگانە برێك پارە وەردەگرن و شوێنی خەوتن و مانەوەش بۆ قوتابیانی دەرەوەی شار دابین دەکرێ کەچی بۆ قوتابیانی خوێندنی ئێواران جگەلەوەی جێگەی مانەوەیان بۆ دابین ناکرێ و پارەی مانگانەیان نادرێتێ ئەوا سالانە بۆ پەیمانگاکان ( ٢٠٠,٠٠٠ ) دوو سەت هەزار دینار و بۆ کۆلیژەکان ( ٤٠٠,٠٠٠ ) چوار سەت هەزار دینار لە هەر خوێندکارێك وەردەگرن ,

ئەمەش بۆتە بارێکی گران بەسەر شانی ئەو قوتابیانە چونکە خوێندکار هەیە خانووی کرێ ی گرتووە یان رۆژانە هاتوو چۆ دەکات بە ئۆتۆمبێل لە قەزا و

ناحیەکان بۆ ناو شارەکان یان بە پێچەوانەوە لەناو شارەوە بۆ ئەو قەزایانەی کۆلیژ یان پەیمانگایان تیایە جگە لەمەش ڕەچاوی شوێنی دانیشتنی قوتابیان و تەمەنی قوتابیانیان نەکردووە ، چونکە بەشێکی زۆر لەو خوێندکارانەی خوێندنی ئێواران فەرمانبەرن و ژن و منداڵیان هەیە و ئەو مەسروفە زۆرە و ڕێگای دووریشی ڕەنگدانەوەی نێگەتیفی هەیە لەسەر خودی خوێندکارەکە و خێزانەکەی لەرووی ئابووری هەم بۆ ئەو خوێندکارانەی فەرمانبەرن دەبێ فەرمانگەکان زووتر جێ بهێڵن .

# بۆ نەوەی داهاتوو

ئەو مرۆڤەی کە لە تەمەنی منداڵییەوە رەش و سپی لە یەکتر جیاناکاتەوەو دایك و باوکان نەتوانن هەنگاو بە هەنگاوی تەمەنی فێرە خۆشەویستی و راستگۆیی و تێگەیشتن لە ژیانی مرۆڤایەتی بکەن بە تایبەتیش لە سەرەتای تەمەنی تا کاتی هەرزەکاری ناسکترین تەمەنیەتی ئەوە گومانی تیانییە کە مرۆڤێکی تێگەیشتوو بە توانا دەبێ بەداخەوەش لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەمانە لە کەم خێزاندا پەیرەو دەکرێ ، بۆیە تا ئێستاش نەمان توانیوەهەنگاوی سەرکەوتوو بهاوێژین لەم بوارەدا ، دەبوایە لەم چەند ساڵەی دوای راپەرینە مەزنەکەی ساڵی ۱۹۹۱ زیاد لە پێویست خۆمان تەرخان بکردایە بۆ دروست کردنی نەوەیەکی تازەی بەهرەدار بۆ دوا رۆژی ئەم میللەتە ماندووەی کە چەندین ساڵە لە ژێر رکێف و فشاری یاسایەکی چەوت دەژین ، بەلام منداڵانی ئێمە مەگەر باس لە پاڵ نانی عارەبانەو کۆڵ کێشی و سندوقە بچکۆلانەکەی بۆیاغ چیەتی و جگەرە فرۆشی و گوڵەبەرۆژەفرۆشی و عەلاگە فرۆشی و نەخوێندەوارییەوە یاخود دەبێ باس لەوە بکات کە دەتوانێ لە بەیانیەوە تا ئێوارە پێنج دینار یاخود دە دینار بهێنێتەوە بۆ کۆشی دایکە رەش پۆش و فرمێسکە قەتیس ماوەکەی ,بۆ ئەوەی رۆژێکی تریش لەگەڵ براو خوشکەکانی بژێت منداڵێك کە تەنیا هەنگاو بنێ لە پێناو پاروێك نان چۆن دەزانێ جەژنی منداڵان چیە ؟ کێ لەم جەژنەی خۆی گوڵێکی بە دیاری دەداتێ دەستە ماندووەکانی توند توند دەگوشێ ، منداڵێك کە لە پێناو براو خوشکەکانی کۆڵ نەدات و بە بڕی پارەی کارەکەی (دەفتەرێك و قەڵەم و کتابێك)ی قوتابخانەیان بۆ بکرێ کەچی خۆی لە (دارا دوو داری دی) حاڵی نەبێ چۆن دەزانێ ئەمشەو ساڵێکی تریش لە تەمەنی تێپەڕ دەبێ ، منداڵێك کە لە گزنگی بەیانی تا ئێوارە بازاڕی رەش ماڵ و جێگای بێ و وانەی تەنیا

گوتنەوەو پیا هەڵدانی ئەو شتانە بێ کە دەیی فرۆشێ و نـان خـواردنی سـێ ژەمـەش تەنیا سەمونی وشك بێ دەبێ چ چارەنووسێك چاوەڕێی بێ ؟

خۆزگە لە یـادی جـەژنی جیهـانی منداڵانـدا لایەنـە پەیوەندیـدارەکان بـە جـددی لـە بـارودۆخی ئێـستای منـداڵی کوردیـان دەکۆڵییـەوەو چارەسـەری گونجاویـان بـۆ ئـەو هەموو گیروگرفتە دەروونی و ئـابووری و پـەروەردەیی و کۆمەڵایەتییـە دەدۆزییـەوە کە رۆژانە دووچاری منالآنی کورد دەبێتەوە.

# مندالّ و ئاوازی مۆسیقا

کەس نیە لە ئێمە کاتێ گوێی لە مۆسقای میللەتەکەی ئەبێ دەروونی نەخرۆشێ و هەست بە ساتێکی خۆش نەکات و نەچێتە دونیایەکی تایبەت و لەگەڵ ناخیا تێکەڵ نەبێ.. جا گەر دەنگێکی رەسەنیش لەگەڵیا بچریکێنێ ئەوە دەبێتە هاودەردی مرۆڤەکە لە خۆشی و ناخۆشیا!

مۆسیقا لە ساڵانێکی زووەوە سەری هەڵداوەو هاوکات لەگەڵ مرۆڤ بۆتە هاوڕێیەکی نزیکی ووەکو ئاشکراشە ئاواز و مۆسیقای هەر میللەتێك بە گوێرەی ناوچەو وڵات و وڵاتێکی ترو لە نەتەوەیەکی ترەوە بۆ نەتەوەیەکی تر جیاوازیان هەیە هەر وڵاتە جۆرە ئاوازێکی تایبەت بەخۆی هەیە ، گومان لەوە دانیە کە ئێمەی کوردیش نەتەوەیەکین ئاواز و مۆسیقای تایبەت بەخۆمان هەیە کە لە باوك و باپیرانەوە بۆمان جێماوە وتەعبیر لە فۆلکلۆری گەلەکەمان و ئێش و ئازاری نەتەوەکەمان و سروشتی کوردستانەکەمان دەکات ، بەلام بە هۆی دابەش بوونی خاکەکەمان بەسەر چەند نەتەوەیەکی جیا , ئاواز و مۆسیقامان لەلایەن دەسەلاتدارانی ئەم وڵاتانە بەندکراوەو رێی لێ گیراوە ، بەلام هونەرمەندە نەمرەکانمان توانیویانە بە دەنگە خۆش و ئاوازە بە ئازارەکانیان و پەنجە ناسکەکانیان بەرەنگاریان ببنەوەو نەیان هێشتووە هونەرەکەمان بەیەك جارەکی ون ببێ .

کوردستانی باشوور کە بە کوردستانی عێراق ناونراوە هەرلەدوای راپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ و زۆربوونی دەزگاکانی راگەیاندن وەك تەلەفزیۆن و رادیۆ کەچی بەداخەوە بەپێی پێویست لە خزمەتی هونەری میللەتەکەمان نەبوونە بەڵکو ئەوەی زیاتر بینومانەو گوێبیستی بووینە هونەری بێگانەیان سەپاندۆتە سەر هونەری خۆمان بەتایبەتیش تەلەفزیۆنەکان ، بەحوکمی ئەوەی وێنەشیان لەگەڵە

بۆیە دەبینین زۆربەی منداڵانمان کە دوا رۆژی ئەو میللەتە پێك دەهێنن مێشکیان وەکو لاپەرەیەکی سپییەو هەرچی تیا تۆمار بکرێ زۆر بە زەحمەت رەش دەکرێتەوە , بەو هۆیەوە زۆربەیان لە قوتابخانەو لەسەر شۆستەو لە نێو کۆڵانان بە دەنگە ناسکەکەیان گۆرانی تورکی و فارسی عەرەبی دەچڕن وەکو ئەوەی گوێیان لە دەنگی هونەرمەندانی کورد هەر نەبووبێ و نەزانن کە کوردیش سەدان هونەرمەندی گەورەی هەبووەو هەیە ، ئەم دیاردەیەش وا دەکات لە دوا رۆژدا هیچ شارەزایەکیان دەربارەی هونەری خۆیان نەبێ, بۆیە ئاواتە خوازم کە بەرپرسانی دەزگا راگەیەندنەکان سنورێك بۆ ئەم تێکەڵ کردنە دابنێن و وەزارەتی پەروەردەش بڕیاری ئەوە بدات کە پێویستە وانەی مۆسیقا و گۆرانی لە قوتابخانەکان پشت گوێ نەخرێ و وەکو وانەکانی تر مامۆستای بۆ دابین بکرێ و گۆرانییە رەسەنەکان بەگشتی و سروودە نیشتمانییەکان بەتایبەتی ، بە منداڵانی کورد بگوترێ .

## ڕەوشی تەلەفزیۆن و ڕەنگدانەوەی لەسەر منداڵان

تەلەفزیۆن یەکێکە لە دەزگاکانی بواری ڕاگەیاندن کە بەبێ پرس دەگاتە زۆربەی ماڵان ، بێگومان ئەمەش یەکێکە لە کارە جوانەکانی بیری مرۆڤ کە ڕۆژبەڕۆژ لەبەرەو پێش چووندایە ، لە کوردستانەکەی خۆمان هەر لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ەوە چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی بەزمانی کوردی پەخشی خۆی هەبووە ، ئەمەش تاڕادەیەکی زۆر دڵی جەماوەر و بینەرانی شادکردووە ، بەڵام بەداخەوە بینەران سوودێکی کەمیان لەم تەلەفزیۆنانە بینیوە چونکە فیلم و وێنەی وانیشان دەدەن کە ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر بینەران هەیە ، بەتایبەتیش منداڵان کە ئێستاشی لەگەڵدابێ گۆڕان کاریەکی ئەو تۆ نەکراوە لە ڕووی هەڵبژاردنی فیلمێکی گونجاو بۆ بینەران کە منداڵیش یەکێکە لەو بینەرانەی سەیری تەلەفزیۆن دەکات و زۆربەی ڕووداوەکانی نێو فیلمەکە بەڕاست دەزانێ و کاری لێ دەکات ، بۆ ئەم مەبەستەش لە کۆنفرانسێکی تایبەت لەسەر داهاتووی منداڵ لە وڵاتی ئیسپانیا کە لەسەر چەند منداڵێك ئەنجام درا بوو ، گەیشتنە ئەو ڕاستییەی کە ئەو منداڵانەی بەردەوام لەشاشەی تەلەفزیۆنەوە سەیری فیلمی ترس و تووڕەیی دەکەن لە ئایندەدا ئاکامی خراپی لەسەریان دەبێتو هەمان کارەساتی نێو فیلمەکان دووبارە دەکەنەوە . ئاماژەیان بەوەش کرد کە ئەو منداڵانە بەرەو دوا ڕۆژێکی ترسناك دەچن و کاریگەریەکی خراپ دەکاتە سەر چین و توێژەکانی کۆمەڵگا ، لە کۆتایی کۆنگرەکەدا بڕیاریاندا کە ڕێژەی فیلمی ترس و تووڕەیی تەواو کەم بکرێتەوە و ئەو فیلمانە لێ بدرێ کە کاری باش و ڕەوشت فێری منداڵان دەکات ، بەداخەوە لە کوردستانەکەیئێمە نەك تەنها کۆنفرانسێك نابەستن بەڵکو وشەیەکیش نادرکێنن !

لـە تەلەفزیۆنـەکانی لای خۆمـان هەرچـەندە ماوەیـەکی دیـاری کراویـان بـۆ مـاوەی منداڵان دەست نیشان کردووە ، بەڵام هەر دوای تەواو بوونی ماوەی منداڵان بەچەند سـەعاتێك فیلمـی شـەڕو کوشـتن و دزی و تـرس و خراپـی و چـەندانی تـر پـەخش دەکرێن ، زۆرجار ئەوماوەیـەی کـە تـەرخان کـراوە بـۆ منـداڵان زۆربـەی بابەتـەکانی شـەڕو گرتنـی زەوی لەلایـەن ئەسـتێرەکانی تـرو حەسـادەت و شـتی خورافیـات و خەیاڵین ! یاخود فیلمەکانی شەو کە لـەکاتی سـەیرکردنیاندا مرۆڤـی گـەورە تـرس و سام سەرتاپای لەشی دەگرێتەوە چ جای منداڵ ! بۆیە زۆرجاران گوێمان لـە منـداڵان دەبـێ یـاخود دەیـان بیـنین لـەکاتی یـاری کـردن و شـەڕی نێوانیـان خۆیـان دەکـەن بەیەکێك لە پاڵەوانە دڕندەکان و لاساییان دەکەنەوە لە شەڕو کوشتنداو ناوی خۆیان بە ناوی پاڵەوانەکانەوە بانگ دەکەن ! جا ئەمانەو چەندانی تـر پرسیارن ئاراستەی بەرپرسـانی تەلەفزیۆنـەکانی لای خۆمـان دەکـرێ بـۆ ئـەوەی تۆزێـك بـەزەیتان بـەم منداڵانـەی ئێمـەش بێتـەوە و بـا لـە ئێـستاوە ئـەوانیش لێمـان نـەبن بـە (رامبـۆ و ئارنۆڵد) ئەوشمان لەیاد نەچێ کە فیلمـی (نێرگـز بـووکی کوردسـتان)ە کـە فیلمێکـی کوردیـە لـە دەرەوەی وڵات نـەیان هێـشت نیـشان بـدرێ لەبـەر ئـەوەی لەیـەکێ لـە دیمەنــەکانی ئــەم فیلمــەدا (مــەڕێك) ســەر دەبــڕن کەچــی رۆژانــە لەشاشــەی تەلەفزیۆنەکانی لای ئێمە بەدەیان و سەدان لاشەی مرۆڤ بە منداڵان نیشان دەدرێ !

# نێریش بدۆشی هەر نیشانەی ئاخر زەمانەنییە !

زۆرجار لە گفتوگۆی نێوان دوو کەس کە لە قسەکانی یەکتر حالی نابن و ئەوەی پێی وایە قسەکانی جەنابی راسترە ،ئەوە زوو بۆ سەلماندنی قسەکانی پەنا دەباتە بەر ئەو مەسەلە کوردیەی کەدەڵێت ئەمن دەڵێم (نێرە ئەویش دەڵێ بیدۆشە) واتا جەنابی چاك دەزانێ قسەکانی راستە وەك ئەوەی کە نێر نادۆشرێ تا ئێرە ئاسایی بوو ! دەڵێن باپیرانمان لە کۆنەوە هەر پەندو قسەیەکی نەستەقیان کردبێ ئەوە هەقیقەتێکە و لە بەسەرهات و چیرۆکێکی راستیەوە سەرچاوەی گرتووە ، وەك ئەوەی دەڵێن ((نێرە بیدۆشە)).

بێ گومان هەمووومان دەزانین ئاژەڵی نێر شیردەر نییە بەڵام سەیرەکەی لەوەدایە لە مانگی (٩)ی ئەمساڵ (١٩٩٩) لە شاری هەولێر دەنگۆیەکی ئاوا بڵاو بۆوە کە گوایە لە یەکێ لە گوندەکانی دەوروبەری شاری هەولێر نێریەك هەیەو شیر دەدات ! شیرەکەشی وەك کوردەواری خۆمان گوتەنی (دەرمانی حەوت دەردانە) :شێرپەنجە ، نەزۆکی ن نەخۆشی شەکرە ، نەخۆشی گەڕبوون ، ... هتد لەو دەنگۆیەدا پروپاگەندەی ئەوەش کرا گوایە ئەم کارە نیشانەی ئاخری زەمانە ئەگەر نا چۆن نێری شیری دەبێ؟!

بۆ ئەسلی مەبەست پروپاگەندەی نێری لە رۆژنامەکانی نێوخۆ بڵاو بۆوەو هەندەی پێ نەچوو لە رۆژانی (٩و١٠و١١)ی مانگی (١٠) لە سێ کەناڵی تەلەفزیۆنی چاوپێکەوتن لەسەر نێری کرا ، نێری کەوتە سەر شاشەی تەلەفزیۆن و قسە لەگەڵ خاوەن نێری کرا ، کە چۆن خەڵکی رویان تێ دەکەن بۆ وەرگرتنی ئەم شیرە ,خاودنەکەی ووتی لەبەر ئەوەی نێریەکە شیری کەمەو رۆژی تەنیا بایی پیالەیەك

شیر دەدات بۆیە تا حەوت مانگی تر سڕەی بۆ گیراوە و لە شارەکانی نێو رژێم و دەرەوەی کوردستانیش بۆی هاتوون ، بەلام ئەوەی لەوەش سەیرتر بێ ئەوەیە کە بەهەمان شێوەلە گوندێکی تریش کەسەر بە ناحیەی خەباتی شاری هەولێرە نێریەکی تر شیردەرە واتە ئێستا لە گوندی (جمکە ) و لە گوندی (یارنجا) دوو نێری شیردەر هەیە ! لە درێژەی چاوپێکەوتنەکانی تەلەفزیۆنی لەگەڵ خاوەن نێریەکان و پیاوە بەتەمەن و بەسالاچووەکانی هەردوو دێ ئەیان ووت ئێمە زۆرجار شتی وامان بینیوە کە نێری شیردەر بێ بەلام چونکە کاتی خۆی تەلەفزیۆن و رۆژنامەکان نەدەگەیشتنە گوندەکانی ئێمە بۆیە وەك ئێستا نەبووە لە هەمان کات لە کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ پزیشکەکان ووتیان ئەم کارە کارێکی زۆر ئاسایی یەو شیرەکەی ئەو دوو نێریەش هیچ مادەیەکی تری تیا نیە کە نەخۆش چاك بکاتەوە واتە جیاوازی نیە لە نێوان شیری ئەو دوو نێریەو شیری بزن و مەڕ ئەو کردارەش وەك نێرەمووکی مرۆڤ وایە ...بەلام ئێستاش ئەوانەی (بەبەران دەڵێن کوڕی مەری)لایان وایە نیشانەی ئاخری زەمانە!؟

# وەفایەك بۆ ئەلف و بێی نوێ

ناتوانم بڵێم ئەو کتێبەی باسی لێوە دەکەم سەرەتای خوێندنی قۆناغی سەرەتایی هەموو مامۆستاو خوێندەوار و رۆشنبیر و زانا و ئەدیبی ئێمەیە، بەڵام دەتوانم بڵێم بۆ ئەوەی ئێستاکەمان کە نزیکەی(٥٠) ساڵە بناغەی زۆر لەو کەسە ناسراو و رۆشنبیرو مامۆستایانەی ئێستامانە کە ئێمە شانازییان پێوە دەکەین بۆ ئێستاو داهاتوومان ، بۆیە هەقە وەفاداربین بەرامبەر بە مامۆستا(ئیبراهیم ئەمین باڵدار) وەك زانایەك لە ریزی زانایەکانی تر باسی بکەین و هەقە شانازی گەورە بەم کتێبە و نووسەرەکەی بکەین کە بۆتە بناغەی فێربوونی هەزارەها کەس و نەتەوەیەکی ژێر دەست و ئەم پەرتوکەش ببێتە مێژووی خوێندنی ئێمەو تا منداڵێکی کورد مابێ سەرەتای خوێندنی لەم کتێبەوە دەست پێ بکات ، ئەمەش مانای وانییە کە من باوەڕم بە گۆڕانکاری نییە ! بەڵکو سەد لە سەد لەگەڵ گۆڕانـدام ، بەڵام بەمەرجێ لەوەی پێشووتر باشتر و کاریگەر ترو پێشکەوتوو تر بێ ، کەچی هەست دەکەم هەر دوای راپەڕینی بەهاری(١٩٩١) لە جیاتی ئەوەی پتر پەرە بە پەرتوکی کوردی و قۆناغی سەرەتایی و قوتابخانە بدرێ و ژمارەیەکی پتریان لێ چاپ بکرێت و رەنگاو رەنگ تر بکرێن ، بەداخەوە زۆربەی پەرتوکەکانی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی وەك ساڵانی بەر لە راپەڕین تەنانەت وێنەکەی دیکتاتۆر(سەدام حوسێن)یشیان هەر پێوەیە و جوگرافیا و مێژووش هەر ئەو جوگرافیا و مێژووە شێوێندراوەیە کە کاتی خۆی بە ئێمەیان دەوت و رژێم لەبەرژەوەندی خۆی دایناوە.

بۆیە لەجیاتی ئەوەی گۆڕانکاری لەم کتێبانەدا بکرێ ، لە (ئەلف وبێی نوێ) کراوە ! هەست دەکرێ هەم کتێبەکەو هەم بۆچوونی نووسەرەکە دەشێوێندێ ، ئەم نووسەرە

بەڕێزە تا لەژیاندا مابوو یەك پارچە کاغەزی ڕێزلێنانی لەلایەن حکومەتی هەرێم و وەزارەتی پەروەردەوە پێ نەبەخشرا، لە لایەکی ترەوە دەچیتە هەر شارێ لە کوردستان ئەم کتێبە جۆرێکی ترە !! بۆ نموونە لە چاپی ئەمساڵ(٢٠٠١) لە سلێمانی ئەم کتێبە کراوە بە (ئەلفبێ) نازانم بڵێم : نووسەرەکە یان وەرگێرەکەی یان تێکەڵکەرە بەڕێزەکەی (عەبدوڵڵا محەمەد ئەمین) ، کە ڕێزم بۆ ئەم مامۆستا و نووسەرە بەڕێزە هەیە، بەڵام بەداخەوە کاتێ ناوەڕۆکی کتێبەکەم خوێندەوە بە وێنەکانیشەوە بە ڕاستی سەرسام بووم ، چونکە زۆربەی زۆری وانەکان یا بڵێم هەمووی بە دەستکارییەوە بابەتی کتێبی (ئەلف و بێی نوێ)ی زانا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)ە ، کەچی ناوی کەسێکی تری بەسەرەوەیە و ناوەڕۆکێکی ئاڵۆزتر و قورستر لەوانەکاندا دیارەو دەتوانم بڵێم ئەم جۆرە کتێبە زۆر زەحمەتە منداڵی تەمەن(٦) ساڵەی پێ پەروەردە بکرێ ، بەهەر حاڵ دەکرا ئەم کتێبە(ئەلفبێ)ی بەڕێز (عەبدوڵڵا محەمەد ئەمین) هاوار بوایە ئەوەیش بەوەی کە هەندێ لەوانەی تازەو ناوی تازەی بخستایەتە نێو کتێبەکە و لە ژێر وانە و لێکدانەوە تازەکاندا بنوسرایە (عەبدوڵڵا محەمەد)، چونکە بەڕاستی سەرەتای کتێبی (ئەلفبێ) بەچەند وێنەیەکی تازەو ڕەنگاوڕەنگ ڕازاوەتەوە کە منداڵان واڵێ دەکات سەرنج ڕاکێشبن بەرامبەر بە خوێندن و وێنەکێشان بۆیە هەق وابوو ناوی زانا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) لەسەر بەرتووکەکە بمابایەو بنوسرایە بەستکاری یان هەر دەستەواژەیەکی تر بەڕێز (عەبدوڵڵا محەمەد ئەمین)، چونکە وەك وتم بابەتەکان دیارن کە هی (باڵدار)ن بۆ نمونە لە یەکێ لەوانەکانی (ئەلفبێ)دا نوسراوە :

داو

دارا ، وەرە

داوە ، داو

وەرە ، داوە

کەچی لە (ئەلف بێی نوێ)ی (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) نووسراوە :

داو

وی، وی ، داو

داوی ، دارا ، داو

من نالێم ئەم جۆرە دەستکارییە کارێکی خراپە ، بەڵام مەبەستم ئەوەیە کە هەقی (باڵدار) خوراوە یان بڵێین پێشێل کراوە ، چونکە ئەمە بیرۆکەی (باڵدارە)و پێشتر چاپ کراوە و ئەمیان سوودی لێ وەرگرتووە ، بەڵام لەوانەی (دۆ)دا ، باڵدار نوسیوویەتی :

دادە ، دۆ ، دۆ

وەرە دارا ، وەرە

دادە دۆی زۆرە

دەی زوو وەرە

کەچی بەڕێز (عەبدوڵڵا محەمەد ئەمین) نووسیویەتی :

دۆ

دۆی سارد

دۆی سارا ساردە

سەرباس وەرە دۆ دۆی سارد

یانی بەهەمان شێوە بیرۆکەی (باڵدار)ە ئەمیان کورتی کردۆتەوە جگە لەمانە چەندین واتاو واتەی تری دەستکاری کردووە ، بەڕاستی نازانم بۆ بەم شێوەیە مافی مامۆستای زانا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) پێشێل بکرێ و بە مەبەست و ئارەزوو دەستکاری لە وانەکانی دابکرێ !؟ هەر چەندە یەك دوو وانەی تازەم بەرچاو کەوت ، یەکێکیان بەم شێوەیە بوو :

داس

داسی سەردار

داسی سەرباس

سایە وەرە

بەراستی نازانم منداڵ چی لەم هەموو پیتی(س)و ووشەی (داس)ە حاڵی دەبێت ؟ واهەست دەکەم وانەکانی مامۆستا (باڵدار) زۆر زۆر لەم بابەتانە بەماناترن ، من ئەم وانەیەی سەرەوەم بە راستی وەك ئەو یاریەی هەولێر دێتە بەرچاو کە گەورەکان بۆ کات بەسەر بردن دیڵێن (هەشت تەشتە شلە ساوار ئەی بابە چەند خۆشە هەژدە تەشتە شلە ساوار) کە دەبێ کەسێك سێ جار ئەم رستەیە لەسەر یەك و بە پەلە بڵێیتەوە ، بێگومان زۆر کەس لەم یارییە دەرناچێ ، چونکە لەبەر تێکەڵ بوون و دووبارە و سێ بارە بوونەوەی پیتەکان و لەیەك چوونیان بە گرانی دەگوترێتەوە ! ئەم مامۆستایە لە وانەیەکی تریشدا کە پێی وایە لە هی (باڵدار) کاریگەری باشترە بەم شێوەیەی نووسیوە :

دەوری

دارا وەرە

دیار وەرە

دایە دایە

دەوری دەوری

لەهەمان کاتدا نا هەقییەکی تریش بەم کتێبەو نووسەرو وێنە کێشەکەی کراوە کە ئەویش ئەوەیە ئەم کتێبە وەرگێڕدراوەتە سەر شێوەزاری (لەهجە)ی کرمانجی سەروو(شێوەزاری بادینی بەناوی (ئەلیف و بێ یا کوردی) بەڵام بەداخەوە ئەمجارەشیان زۆربێ بەزییانە مافی مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) کە من پێم وایە زانایەکی مەزنی کوردە پێشێل کراوە جگە لەوەی کە بەشێوەیەکی وەها ناوەرۆکی دەستکاری کراوە (رستەکە تەواو نەکراوە) ئەوە لەسەر بەرگی نەنووسراوە کە نووسینی (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)ە، بەڵکو تەنیا نووسراوە (بەرهەفکرنا مەجید محەمەد سەعید) با جلۆری+ وارتێکس موسێس سەرکیسیان) کە ئەم جارەشیان

بیرۆکە و وانەکانی ئەم کتێبە هەمووی هی مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)ە دەستکاری هەندێ لە ووشەو ناوەکان کراوە.

بۆیە من نامەوێ هەر هەموو وانەکانی مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) بنووسمەوە و هەموو واتەکانی ئەم دوو کتێبەش بنووسمەوە بۆ ئەوەی راستیەکان بەباشی بەردیدی خوێنەران بکەوێ ، بەلاّم پێم وایە بەم نووسینەش مامۆستایان و شارەزاو پسپۆرانی زمانی کوردی پەروەردەکار ئەم راستییە باش دەزانن نووسینەکانی مامۆستا(ئیبراهیم ئەمین باڵدار) هەمووی بەم شێوەیە داڕشتووە کە بتواندرێت وەك (نواندنی) شانۆی ئەنجام بدرێن بۆ ئەوەی منداڵان شەرمیان بشکێت و لەکاتی خوێندنەوە و ئەزبەر کردنیاندا هەست بکەن کە خۆیان لە نێو راستی نوسین و چیرۆکەکە دان و وەك ئەکتەرێك بجوڵێنەوە ، هەرهەمووان ... (لەوانەی دار ...و دارا دوو داری دی ... و . راو ...مێوژی نایاب کەئێستاشی لەگەڵدابێ کە مێوژ دەخۆین واهەست دەکەین لە مام (زۆراب)مان کڕیوە...و... ئەوا ئازادە سێومان بۆ بەردەداتەوە و... و ... ئێستاش ئەو چیرۆکەم لەیادە کە مامۆستا وەك پرۆڤەی شانۆگەری فێری دەکردین کە چۆن مام گورگ بەچکە کارەکەی مام بزن دەخوات و مام بزنیش چۆن بوێرانە دەچێتە سەربانی مام گورگ ... جا نازانم باسی چیتر بکەم ، بەڕاستی زۆر پێم سەیرە رێگە دراوە بە چاپکردن و هەق خواردنی ئەم زاتە پیرۆزە (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) بەلاّم لەوەش سەیرتر کە هەردوو کتێب لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان چاپکراون و رێگەیان پێدراوە لە قوتابخانەکاندا بخوێندرێن ؟!

لەوانەش سەیرتر ئەوەیە نەتەوەیەك (سێ) شاری بەدەستەوەبێ منداڵانی (٦) ساڵانی پۆلی یەکەمی سەرەتایی بەسێ جۆر کتێب فێری خوێندنەوە و نووسین ببن و پەروەردەبکرێن ؟

لەجیاتی ئەوەی ئێمەی کورد خاوەن یەك زمان و یەك خاك و یەك وڵات و یەك مێژووبین ئەوا لەسەرەتادا منداڵانمان فێرە ناوچەگەری دەکەین وەك ئەوەی : (برا

با كـەسمان هـەقمان بەكەسمانـەوە نـەبێو كەێـشەی مـن هـی تـۆ نیـە و هـی تـۆش پەیوەندی بەمنەوە نیە!) نموونەی ئەوەشم زۆرە بەلام لەدیـدی دوو منـدالی تەمـەن (٧) سـالانەوە بۆتـان بـاس دەكـەم كەیـەكێكیان لەسـلیمانیەو ئـەویتریان لـە هـەولێرە لەسەر وانەی (داو) كەوتنە گفت وگۆ یەكێكیان دەی وت هی من راستە ئەوی تر دەی وت هی من راستە یەكیان دەی وت هی تۆ تازەیـە هـی مـن باوكیـشم هـەمووی لەبـەر كردووە بەلام من بەپێكەنینێكەوە بوومە نێوبـژیوانیان وتم بابـە خـەم مـەخۆن هـی هەردووكتان راستە خوابكا ئێـوە لـەماناى (داوو داونانـەوە)حـالی بـن چونكە ئێمـەی كورد لەوەتەی هەینە داویان بۆ داناوینـەوە واخەریكـە ئێمـەمانیش فێـرببین داو بـۆ یەكتری دانێینەوە بەراستی سەیرە گەر بێت و مندالێكی دهۆكیش بێنی ئەوە دەبێـت مامۆستاو پسپۆڕانی كوردستان بكەونە نێوانیان و لەیـەكتریان حـالی بكـەن ! چـونكە تائێستا گەورەكان لە زمانی یەكتر حالی نابن !؟

## هونەری گۆرانی وتن لە نێوان پاراستن و شێواندندا

هونەر بەشێکە لە ژیانی مرۆڤایەتی کە رەنگدانەوەی خواست و ئارەزووەکانی هونەرمەندە لەنێو هەر میللەتێکدا، هونەری راستەقینەش چ مۆسیقا، گۆرانی، شانۆ ... ئەو هونەرەیە کە گوزارشت لە ئازاری ناخۆشی و ساتە خۆشیەکانی میللەتەکەی بکات و لەگەڵ ناخی جەماوەرەکەی تێکەڵ بێ ، ئەوا بوونی کلتور و مێژووی هونەری ئەو میللەتەش دەسەلمێنێ . بێگومان میللەتی ئێمەش وەکو هەموو میللەتانی دی هونەری مۆسیقا و گۆرانی لەنێو هەموو میللەتێکدا پەرەی زیاتری پێ دراوە و خەڵکی زیاتر گوێی لێ رادەگرن بۆ بەسەربردنی چەند ساتێکی خۆش ، بەتایبەتیش گەر دەنگ و ئاواز و مۆسیقای میللی و رەسەنەکانیان بێ ، کەچی لای ئێمە لەم رووەوە وەکو پێویست نیە ، بۆیە لەهەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکی هونەری باس لەوە دەکرێ کە گۆرانی و مۆسیقای ساڵانی بەر لە راپەڕین کاریگەرتر بو لەسەر جەماوەر نەك ئێستا !.

ئەمە راستیەکەو نکوڵی لێ ناکرێ ، بەڵام پێویستە بزانین بۆچی ساڵانی بەر لە راپەڕین داهێنانی هونەری باشتر بووە نەك دوای راپەڕین .؟ پێش راپەڕین هەموو هونەرمەندێك گەر دەنگیشی باش بوایە بۆ گۆرانی ووتن یاخود مۆسیقاژەنێکی بەتوانا بوایە ئەوا تیپێکی مۆسیقای سەربەخۆ و ستۆدیۆیەکی سەربەخۆی نەبوو وەك ئێستا ، بەر لە راپەڕین هەموو هونەرمەندانی شارێك خۆیان لە نێو تیپی شارەکەدا دەدۆزیەوە ، واتە بەهاوکاری یەکتری بەرهەمی چاکیان وەبەرهەم دێنا نەك وەك ئێستا بەناو گۆرانی بێژێك دەبێتە شاعیر و ئاواز دانەرو مۆسیقا ژەن ، بەڵام ئێستا زۆرینەی تیپ و ئەو بەناو گۆرانی بێژانەی لە یانەی ئاهەنگەکان لێمان بوون بە هونەرمەند و هاندەرێکن بۆ ئەوەی گوێگر لە بەرهەمی رەسەن نەکۆڵێتەوە و گوێ بۆ ئاواز و دەنگی پڕ لە بەهرەی هونەرمەندە بەتواناکانی ساڵانی پێشوو نێستاش رانەگرێ و تەنیا لەگەڵ ئاوازی هەڵپەڕینی ئەو تیپانەوە تێکەڵ بێ جا

ئاوازەکە فارسی ، تورکی،عەرەبی،هیندی بێ ، بۆ ئەم مەبەستەش وەکو هاندەرێکی بەتوانا بوونی ژمارەیەکی زۆری تۆمارگا و دەزگاکانی راگەیاندنەکە دەورێکی چاکیان بینیوە لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان ، چونکە تۆمارگاکان و راگەیاندنەکان تەنیا چاویان بڕیوەتە ئەوەی کامەیان زووتر بەرهەمی تازە بەرگوێ و دیدی بیسەر بخات جا ئەگەر بەرهەمێکی باشیش تۆمار بکەن بۆ هونەرمەندێك واتە کارێکی هونەری کە لە هەموو روویەکەوە خاڵی هونەری نوێی لێ بەدی بکرێ ، بەتایبەتیش رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان ئەوا ئەو بەرهەمە تەنیا دەبێتە موڵکی ئەو کەناڵە، چونکە خۆی بەکارەکە هەڵساوە بۆیە ئەو پێشبڕکێیەی کەناڵەکان وای کردووە مانگی جارێکیش لە شاشەی تەلەفزیۆنەکان چاومان بەدەنگە پڕ لە سۆز و بەهرەمەندەکانی وەك مامۆستا عەلی مەردان ، خاڵە تایەر تۆفیق ، حەسەن زیرەك و چەندانی دی نەکەوێ ! جا لێرە مەبەستم ئەوە نیە کە بەرهەمی لاوەکان نیشان نەدرێ یاخود ئەو تیپانەی ئاهەنگەکان نەمێنێ ! بەڵکو مەرجە گۆرانیەکانیان خاڵی هونەری لێ بەدی بکرێ ئینجا لە راگەیاندنەکان پەخش بکرێ ، بەڵام ئایا کام تەلەفزیۆن یاخود رادیۆ هەیە لیژنەیەکی پێکهێنابێ لە چەند پسپۆرێکی شارەزای بواری مۆسیقا و گۆرانی ؟ گەر هەبوایە ئاوا چاومان بەو جۆرە شێواندنەی هونەرەکەمان نەدەکەوت ، دەبێ ئەوەش بڵێین کاری چاکیش کراوە ، چونکە کاری چاك و بەرهەمی باش نکۆڵی لێ ناکرێ ، کە لەبەرهەمێکا هەست بە بوونی دەنگ و ئاواز و ئەداو مۆسیقا و هۆنراوە کرا وەك ئەو کارانەی هونەرمەندانی دەرەوەی وڵات و هەندێ لەو هونەرمەندە لاوانەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆك ، بەڵام بەداخەوە کاری چاك و بەرهەمی باش لەنێو ئەو بەرهەمە نەشاز و خراپانە خنکێندراوە ، بۆیە پێویستە تیپە میللیەکان بەگوڕتر و بەتوانایەکی تر بێنەوە مەیدان بۆ ئەوەی بتوانن ئاوازی چاك بۆ دەنگ و ئەدای باش بە بەرهەم بێنن نەك بەناو تیپێ هەبێ ، بەڵام خزمەت بەهونەری گشتی نەکات ! گرنگە ئێمە هونەر بەموڵکی گشتی بزانین ، هونەرمەندیش دەبێ خۆی بەموڵکی جەماوەر بزانێ تا خەڵکی گوێی بۆ شل کەن ، کە بڵێ نا بۆ شەڕ (شەڕ دوژمنی ژین و توخمی ئینسانە) نەك هاندەری شەڕی نێوخۆبێ .

# بۆ ئەوەی هەمیشە دەنگە نەمرەکان زیندووین

لە فۆلکۆری نەتەوایەتیمان بواری مۆسیقا و گۆرانی پانتایەکی نێجگار فراوانی داگیرکردووە کەسانێکی زۆریش بونەتە هۆی پاراستن و گەشە پێدانی ئەم بوارە بەتایبەتی ئەو هونەرمەند و هونەر دۆستانەی لە سەرەتای سییەکانی ئەم سەدەیە بەسەرکەوتویی بەدەنگە پڕ لە جۆش و خرۆشەکانیان سنوری نێوان شاروشارۆچکەکانی هەر چوارپارچەی کوردستانیان شکاندووە چەند هونەرمەندێکی دیار و بەرچاون کە تا ئێستاش لەگەڵدابێ کاتێ گوێمان لە دەنگ و ئاوازەکانیان دەبێ وا هەست دەکەین تازەترین بەرهەمی ئەم ساڵانەیە لەرووی دەنگ و ئاواز و مۆسیقاوە ئەوەندە کاریگەری هەیە لەسەر هەست و سۆزی گوێگران هەست ناکرێت کە ئەم گۆرانیە زیاتر لە نیو سەدەیە بەئامێرێکی سادە و ساکار تۆمارکراوە ! بەڵام زیندوێتی ئەم گۆرانیانە لەوەدایە کە پەیڕەوی هەرسێ بنەماکانی گۆرانیان کردوە (دەنگێکی باش و خۆش ، ئاوازێکی رەسەنی فۆلکلۆری کوردی ، هۆنراوەیەکی ناسك و سادە)کە پڕاوپڕ لە جوانی سروشت و لەنجەولاری ئافرەت و ووشەو پەیڤی خۆشەویستی یە ! بۆیە دەتوانین بڵێین مێژووی تۆمارکراوی گۆرانی و مۆسیقای کوردی ئەو بەرهەمە رەسەنانەن کە تا ئێستاش بەر دیدو گوێمان دەکەوێت ، لە کاتێکدا بەشێکی زۆر لەو هونەرمەندە گۆرانی بێژانەی ئەوسا یان نەخوێندەوار بوونە یان چەند ساڵێك لە حوجرە و قوتابخانەی سەرەتایی خوێندویانە کەچی بوونەتە سەرچاوەیەکی بەهێزی هونەری رەسەنی کوردی و هەر ئەم دەنگانەش هاندەری کاریگەر بوونە لەسەر پێگەیاندنی دەیان هونەرمەند و گۆرانی بێژی تر ، بەڵام بەداخەوە لەم رۆژگارەدا سەرباری ئەوەی ئاستی تەکنیکی بۆ تۆمار کردنی گۆرانی زۆر بەهێزە ، کەچی ئاستی هونەری گۆرانی بێژی بەپێ پێویست نیە ! هەندێ لەو گۆرانی بێژە لاوانەمان لەکاتی دیداری هونەری لە رۆژنامە و رادیۆ و tv

ی یەکاندا دەڵێت ئێمە گۆرانی بۆخۆمان دەڵێین ! کەچی جاری وا هەیە لەساڵێکدا دوو سێ CD بڵاو دەکاتەوە ! هەشیانە زۆر بەراشکاوانە دەڵێ من گۆرانی بۆخۆم ناڵێم بەڵکو بۆ ئەو جەماوەرە دەڵێم ئەوان دەتوانن بڕیار لەسەر کارەکانم بدەن ! لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە بەشێك لەم گۆرانی بێژانە گوایە گوێ لە هونەری رەسەن دەگرن و شارەزاییەکیان لە هونەری پێش خۆیان هەیە ! چەند گۆرانییەکی هونەرمەندە رەسەنەکان تۆمار دەکەنەوە یاخود ئاوازی گۆرانییەکانی ئەم هونەرمەندە نەمرانە بۆ هۆنراوەیەکی تر دەڵێتەوە کەئەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی گۆرانییە رەسەنەکە ! چونکە من لەوە دڵنیامە زۆر زەحمەتە کەسێك وەك هونەرمەندی مامۆستا (حەسەن زیرەك) بتوانێ گۆرانی (دەنگی یارم نایە) یان (چارۆگە سور تۆبە) بێ یان (نەورۆز) بڵێنەوە لە کاتێکدا حەسەن زیرەك لەسەر گۆرانی نەورۆز چەند رەخنەیەکی هونەری لێگیراوە بە تایبەتی لەسەر ئەوەی کە هۆنراوەکەی هەموو نەووتوە کەچی تا ئێستا چەندین گۆرانی بێژی تر ئەم گۆرانییەی وتۆتەوە بەڵام نەگەیشتۆتە ئاست زیرەك .

یاخود کەس هەیە وەك (محەمەدی مامڵێ)ی نەمر و هاوخەمی عاشقان گۆرانی (یادی بەخێر) و (زەمانە گوڵێکی دامێ) و (دەنگی قورینگان دێ) بڵێنەوە, یان چ گۆرانی بێژێك هەیە وەك هونەرمەندی بە توانای گۆرانی و مقاماتی کوردی مامۆستا (عەلی مەردان) گۆرانی (ئای چەندم خۆش ئەوێ) و (گەردەن بلور) بڵێنەوە یان کەس هەیە لە خەمی پیرەکانمان تێبگات و وەك (علی مەردان)(کەی دێتەوە کاتی لاویەم کەی دێتەوە) بڵێ یان چ گۆرانی بێژێك هەیە وەکو دەنگە پڕ لە شۆڕشگێڕییەکەی (تاهیر تۆفیق) (سەدەی بیستەمە کوردە غیرەتێ) و(شیرین بەهارە) بە بەهاری کوردستان ئاشنا بکاتەوە ! ئەمە گومانی تیانییە کە لەم رۆژگارە هیچ گۆرانی بێژێك نیە بتوانێت خۆی لە توانا هونەرییەکانی ئەم هونەرمەندە گۆرانی بێژانە بدات وەك لاسایی کردنەوەی کارەکانی ئەوان !کە جێگای شانازین بۆ ئێمەی هونەر دۆستان بۆیە ناکرێت و رەوانییە هەر گۆرانی بێژێك بە ئارەزووی خۆی

دەستکاری ئاواز و ووشەی ئەم هونەرمەندانە بکات یاخود بە (نەشاز) بیڵێتەوە ! چونکە ئەم بەهەرمە رەسەنانە بونەتە ناسنامە و مێژووی هونەری گشتی نەتەوایەتیمان نەك مولکی تاکە کەسێك ! بۆیە تکا دەکەم بە ئارەزووی خۆتان دەستکاری ئەم بەرهەمانە نەکەن وەك دەڵێن (دەستی لێمەدە با خراپ نەبێت) چونکە ئەو هونەرمەندە رەسەنانە لە ژیاندا نەماون تا خۆیان سکاڵا و نارەزایی دەربڕن لەسەر ئەم دیاردە نەگە تیڤە ! بەڵام دڵنیامە خانەوادەکانیان و هونەرمەندان و هونەر دۆستان بە دەنگێکی پڕ لە نارەزایی و حەسرەتەوە دەڵێن (کە زیندوو بوون نەتانگرت قەدریان کەمردووشن مەشێوێنن بەهرەیان).

# هەموو عەودالی گوڵە سوورەکەین

زۆرن ئەوانەی خزمەتیان بە هونەری مۆسیقاو گۆرانی کوردی کردووەو جێگایان دیارە لە مێژووی هونەریمان کە ناتوانرێ نکۆڵییان لێبکرێ چەندین کاسێتیان لە دوای خۆیان بە جێهێشتووە وەك(سەیدعلی ئەسغەر ، حەسەن زیرەك ، عەلی مەردان ، تاهیر تۆفیق ، محەمەدی مامڵێ و چەندانی تر )بەڵام ئەوانەی بەتەنیا گۆرانییەك یان کاسێتێك ئەرشیفی هونەریان دەوڵەمەند کردووین و ئێستاش خەڵك بە عەشقەوە گوێیان لێ دەگرێ بەڵام تەمەن رێی پێ نەدان زیاتر خزمەت بکەن وەك (خالە سێوە)ی نەمر بەچەند مەقامێك لە کاسێتێك و (قادر دیلان) بەچەند گۆرانی و پارچە مۆسیقایەك لە کاسێتێك و (شەماڵ صائیب)بە کاسێتێك و (قادرکابان) بە کاسێتێك ئەم چەند پەیڤەش لە ساڵیادی هونەرمەند قادر کابان دەخەمەبەر دیدەتان ، قادرکابان ناوی تەواوی (عەبدولقادر جەلال مەحمود)ە لە ساڵی (١٩٣٧) لە شاری سلێمانی لە دایك بووە یەکەم گۆرانیشی کە سروود بوو لە ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ گوتووە ، هەر لەو ساڵە بە دوواوە بەشداریی زۆربەی ئاهەنگ و بۆنە نیشتمانییەکانی کردووەو بە دەنگە زوڵاڵەکەی ئاهەنگەکانی پڕ لە جۆشتر دەکرد .

قادر کابانی هونەرمەند بە ماوەیەکی کەم بووە یەکێ لە گۆرانیبێژە سەرکەوتوەکانی شاری سلێمانی و هەموو کوردستان ، جەماوەرێکی ئێجگار فراوانی هێنایەوە نێو کۆرو کۆبوونەوەو ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقا . کۆی ئەو بەرهەمانەی کە تۆمارکراون و لە تۆمارگاکان دەست دەکەون ئەمانەی خوارەوەن (لەدرزی پەپەوە واتە جادە چۆڵ و... شەمی شەوان ، فریشتە ، بۆ کچێکی شۆخ ، عومری شیرینم ، چاوەڕوانی بێهودە ، یاد ، لەرێی دلداری ، گوڵی سوور)

بـــەلاَم بـــە داخـــەوە تەمـــەنی هونـــەریی ئـــەم هونەرمەنـــدە کـــورت بـــوو لـــە ١٩٨١\٢\٢٨بەعسییە خوێنڕێژەکان بەرەو بەندیخانە بە خوێن سوورکراوەکانی خـەڵکی نیـشتمان پـەروەریان بـرد ، ئـەویش تـا ئێـستا وەك (١٨٢)هـەزار ئـەنفال بـێ سـەرو شوێنەو نازانین لە کامە بەندیخانەو گۆڕە زیندەبە چاڵەکان سروودی ئاشـنا بوونـەوە بە کوردستان دەچڕێ !؟ نـازانین لـە نێـوان کامـە سنووری عێـراق سعودیە ، عێـراق کوێت ، عێراق ئوردن دا زیندەبەچاڵ کراوە و لەگەڵ بـراو خوشـکەکانی لـەنێو گـۆڕە بەکۆمەڵەکان کە ئێـستا گـۆرانی بـۆ کـورد و کوردسـتان دەڵـێن گـۆرانی بـۆ براکانیـان دەڵێن گۆرای بۆ ژیان دەڵێن ، لـە کاتێکدا بـە عـسییەکان لـە فرسـەتێك دەگـەڕێن بـۆ ئەوەی دەمیان جاری تر ئەنفالمان بکەنـەوەو پیاوانمـان بـۆ زینـدە بـە چـاڵ و دایکـان و خوشکانیشمان بۆ کات بەسەر بردنی مومارەسەی سێکسی و هەراجی دەوڵـەتان ! ئـەو لەنێو گۆڕە ونەکەیدا دەڵێ بەسە شەڕی برا کوژی !

ئـا لێـرەوە سـلاَوو درووود وپـاکی ! بـۆنی خـاك و نێرگـزە بـۆن خۆشـەکانی سەرچیای کوردستان !هەوای پاکی ئازادیی نیشتمانتان پێشکەش ! دڵنیام ئێـستا ئێـوەش هەسـت بـە ئـازاری نیـشتمانەکەتان دەکـەن کـە بـە دەسـتی خۆمـان برینـدارمان کـردووە ! دەوەرنـەوە ئەوە دایکان و خوشکان و هاوسـەرو باوکانتـان چاوەڕوانتانن , دەوەرنـەوە بـۆ تـۆراون ئـەوە نیـە کـوڕو براکانتـان لـە سـەنگەری پێـشەوە دانـە بـۆ بـەرگری لـە نیشتمان دەوەرنەوە تا جلە ڕەشەکانی ئافرەتانمان ئـاڵ و والاَ بـێ ئـەی هونـەرمەنـدە سەربەرزەکە لە نیشتمانە ڕەشپۆشەکەتەوە وەفـاو خۆشەویـستی بـۆ تـۆو (١٨٢)هـەزار شوێن بزر کراو ..وەك خۆشت دەڵێی :

لە هەر باخێ گوڵێکی سوورم دیبێ

بۆی چووم گەر هەزار دڕك لە پێم چەقیبێ

ئێمەش لـە هـەر باخـێ گـوڵێکی سـوورمان بینـی بـۆی دەچـین گـەر هـەزاران دڕك لـە پێمـان بـچەقێ بـۆ ئـەوەی بیکـەین بـە باوەشـێ گـوڵی سـوور و بـۆ تـۆو (١٨٢) هـەزار ئەنفالی بنێرین کە نازانین ماون یاخود مردوون!؟

# سۆزێك بۆ كۆچی ( دڵزار مەخمووری )ی كەمانچە ژەن

زۆرن ئەو هونەرمەندانەی لە بواری مۆسیقاو گۆرانیدا خزمەتی بەرچاویان كردووەو تـا لەژیانـدا بـوون وەكـو سـەربازی ون هەمیـشە وەك مـۆم بـۆ هونەرەكـەیان درەوشاونەتەوە ، بەڵام مخابن زۆر كەم باسیان لێوە كراوە و بگرە نـەك هـەر مافیـان نـەدراوەتێ ، بـەڵكو لـە زۆر رووەوە فـەرامۆش كـراون, یـەكێ لـەم هونـەرمەندانـەش هونەرمەندی جوانە مـەرگ(دڵـزار یاسین مـەخمووری) ی مۆسیقاژەنە ، هەرچـەندە دونیای هونەری زۆر كورت بـوو مـەرگی لـە ناكاوی نەیهێـشت خـەون و خـەیاڵەكانی بێتـە دی ، بـەڵام بـە قـەد تەمـەنی خـۆی كـاری جـوان و نایـابی ئەنجامـداوە, هونەرمەنـد(دڵـزار) لـە سـاڵی ١٩٦٩ لـە شارۆچـكەی مـەخموور لـە نێـو بنەماڵەیـەكی هەژاردا لە دایك دەبێت هـەر لـە منداڵییـەوە خولیـای مۆسیقا بـووە و لـە نێـو تیپـی مۆسـیقای میللـی (مـەخموور) تیپـی مۆسـیقای (قەرەچـووغ) بەشـداری ئاهـەنگ و چالاكی دەكات رۆژبـە رۆژ خولیـای هونـەر لـەلای ئـەو هونەرمەنـدە زێـتر دەبێـت و خۆشەویـستی و لـە بـاوەش گرتنـی كەمانـچەكەی زیـاتر نـاخی گـڕدەدات كـە بـە شێوەیەكی ئەكادیمی فێری مۆسیقا بێت بۆ ئەوەی بتوانێ وەك كوردێك خزمـەت بـە هونەری رەسەنی نەتەوەكەی بكات ، بۆیە دوای تەواوكردنی پۆلی سێیەمی ناوەنـدی لە شارۆچكەی مەخموور ناوی لە پەیمانگای هونەرە جوانەكانی سلێمانی دەردەچێ و بە سەركەوتوویی پەیمانگا تەواو دەكات و هەر لە نێو پەیمانگادا بەشداری كردووە لە چالاكییەكان و فیستیڤاڵە هونەرییەكان كاتێ بۆ پشووی هاوینـە دەهاتـەوە مـەخمووز رۆڵێكـی كاریگـەری هـەبووە لـە زیندووكردنـەوەی تیپـی مۆسـیقای قەرەچـووغ و بەشداری هەموو ئاهەنگ و چالاكییەكانی كردووە لەهەمان كاتدا هەوڵی ئـەوەی داوە كەچەندین لاوی شارۆچكەكە فێری مۆسیقا بكات جگە لەمەش ئـاواز و دابەشكردنـی

مۆسیقی بۆ چەندین گۆرانیبێژ ئامادە کردووە لەگەڵ مۆسیقا ژەنانی تر لەوانەش گۆرانی بێژان( پەیمان عومەر، ئەحمەد زەمانە، ئیسماعیل کوێستانی ، جەوهەر سابیر ، فاخیر نامیق ، ئەرسەلان کاروانی ..هتد)

لە دوای کۆڕەوە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ دڵزاری جوانە مەرگیش وەك زۆربەی خەڵکی تری کوردستان لەبەر زوڵم و زۆری و دڕندەیی رژێمی فاشی بەعسی ئەوسا رووەو سنووری ئێران کۆچ دەکات و ژیانی ئاوارەیی و غوربەتی هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی چیتر ژێر دەستە نەبێت ! دڵزاری هونەرمەند سەرباری غەریبی و دوورە وڵاتی نەیدەزانی چۆن هاوخەمی میللەتەکەی بێت و لە ئێش و ئازارو نەهامەتییان کەم بکاتەوە نەیدەزانی کەی دەگاتەوە باوەشی شاخە سەربەرزەکەی قەرەچووغی خۆڕاگر تا گۆرانی بۆ ژیان بڵێتەوە ! دڵزاری هەست ناسك هەمووکات وێنەی کەمانچە بە تاڵان بردراوەکەی لەبەر چاو بوو لە دوورە وڵاتیەوە گوێی لە ناڵەی ژێیەکانی دەبوو! کە چۆن لە ژێر دەستی تاڵان چییەکانی (حاجی عەلی و کەرمردی و نۆمەراوەو گەیارەو شەرگات ...) هاوار دەکات "(دڵزار) گیان بۆ منیشت لەگەڵ خۆت رزگار نەکرد..! من ئێستا بەند کراوم و کەوتومەتە دەستی دەست رەش و تاڵانچیان و زۆر نەزانانە و بێ بەزەیانە بەدەستە پڕ لە تاوانەکانیان ئازارم دەدەن ! بەڵام دڵنیابە بە پەنجە ناسکەکانی تۆ نەبێ بۆ کەسێکی تر ناگریم و ناخی خۆم ئاوەڵا ناکەمەوە"

دڵزاری جوانە مەرگ لە کاتێکا نەیدەزانی دڵنەوای خۆی بەچی بداتەوەو لە تاو سۆزی کەمانچەکەی خۆی ، کەمانچەکەی براکانی تری (مهاباد)ی گرتە دەست و سروودی چڕی بە قەد باڵای قەندیل و قەرەچووغی داگیرکراو لە مهابادەوە فرمێسکی دەڕشت بۆ وڵاتە سوتاوەکەی ناڵەو هاواری بوو، بۆیە لە تاو ئەو ناڵەو هاوارەی (دڵزار) ی هونەرمەند دەنگێکی تری دڵسۆزو هاوخەمی وەك باوکێك بە جورئەتەوە بانگی کردوو پێی وت "من (محەمەدی مامڵێ)م " لەوساتەوە دڵزار تێکەڵ بە خانەوادەی مامڵێی نەمر دەبێت و بە ژەنینی ئامێری کەمانچە بەشداری لە چەندین ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی دەکات لەگەڵ هونەرمەندی گەورە (محەمەدی

مـاملێ)و دوایـن بەرهـەمی هونەرمەنـد محەمـەدی مـاملێ بـە گـوێرەی ئاشـقانی دەنگەکەیی و تەکنیك کـارانی مۆسیقا بـە باشـترین بەرهـەمی (مـاملێ)ی دەزانـن لـە ڕووی هونەری مۆسیقاو دەنگەوە ، ئەمەش ناوی ئەو گۆرانیانەیە کە (دلـزار)ی کۆچ کردوو بە کەمانچە ژەنین بەشداری تیـادا کـردوو (ڕێگاکـەم دوورە ، زەمانـە گولێکی دامێ ، لێم گەڕێ کچێ ، ئەو پەنجەی وا لە بێ هێزی دەلەرزێ ، ئامینـێ گیـان ، ئـەی باخەوان ، وەك مەجنوون ، تاکەی دەمکوژی ) جگە لەم بەرهەمەی مـاملێ دلـزار بـە ئاواز و ژەنینی کەمانچە هاوکاری گۆرانی بێژانی تری ئێران دەکات لەوانـەش گـەورە هونەرمەند (عەزیزی شاهرۆخی)و (حەسەن دەرزی)...

ئـەو هونەرمەنـدە لاوە جگـە لـەوەی توانایـەکی باشـی هـەبوو بـۆ ئـاواز دانـان و دابەشکردن و ژەنینی ئامێری مۆسیقا ، لە هـەمان کاتیـشدا دەنگی بـۆ گـۆرانی ووتـن خـراپ نـەبووە بـەلام خـۆی دەیـووت "لـە مۆسـیقا سـەرکەوتو تـر دەبم بۆیـە زیـاتر گرنگـی بـە مۆسـیقا دەدەم"هەرچـەندە سـێ گـۆرانی بـەدەنگی خـۆی تۆمـار کـردووە یەکیان لەگـەڵ تیپـی مۆسیقای قەرەچووغ و بـە نـاوی (سـۆزی نازێك) و دوانـەکـەی تـریش ئـەو مـاوەی لـە ئێـران بـوو تۆمـاری کـردووە بـە ناوەکـانی ( هـەرکاتێ یـادی رابردوو ئەکـەم)و (یادەکانـت پـشکۆن) کـە هـەر ئـەم گۆرانیـەش (یادەکانـت پـشکۆن) لەلایەن هونەرمەنـدی گەورە عدنان کەریم دووبـارە ووتراوەتـەوە هـەر وەك عـەدنان کەریم دەلێ کە وەکو وەفایەك بۆ دلزار ئەم گۆرانییەی تۆمار کردۆتەوە ، لـە هـەمان کاتدا گۆرانی (کۆچێکی ناوەخـت ) کـە بـەدەنگی عـەدنان کـەریم وتـراوەو لـە ئـاوازی دلزارە ئـەم دوو گۆرانییـەی عـەدنان کـەریم لـە (سـی دی) سـاڵی ١٩٩٧ بلاوکراوەتـەوە چونکە هونەرمەنـدان (عـەدنان کـەریم و دلـزار) جگـە لـەوەی بەیەکەوە پـەیمانگای هونـەرە جوانـەکانی سلێمانیان تـەواو کـرد ئـەوا لـە دوایـین بەرهـەمی(مـاملێ)یـش (عەدنان کەریم بەعود و دلزار بە کەمانچە) بەشدارن .

هونەرمەندی کۆچ کردوو (دلزار یاسین مەخمووری) دوای ئەوەی زیـاتر لـە سـێ سـاڵ لـە ولاتـی ئێـران دەژیـو خـەریکی کـاری هونـەری دەبێـت ، بـەهیوای ئـەوەی بگاتـە

گەورەترین ئاواتی لە مێژینەی کەتەواو کردنی بەشی مۆسیقای پەیمانگای (مۆسکۆ) بوو بەرەو شاری (مهاباد)ی پڕ لە هونەر و کوردایەتی بەجێ دێڵێ و ماڵ ئاواتی لە دۆست و هاوڕێیان و بنەماڵەی مامڵێ دەکات و لە ڕێگای ئێرانەوە بە قاچاغ بەرەو ئەرمینیا دەچێت بۆ ئەوەی لە (ئەرمینیا)ش بەرەو(مۆسکۆ) بڕوات ، بەڵام بەداخەوە لەم ڕێگا سەخت و پڕ بەفرە سەرمای دەبێ و گورچیلەکانی لە کار کردن دەوەستن و دوای نەشتەرگەریش بێ سوود دەبێ و ڕێگەی قاچاغ و هەندەران ئەم لاوەشی بۆ خۆی زەوت کرد و لە ١٩٩٤/١١/١١ لە (ئەرمینیا) بۆ تا هەتایە دڵە مەزن و پڕ لە هیواکەی لە لێدان دەکەوێ و هەر لەم وڵاتەش هاوڕێکانی بە خاکی دەسپێرن .

## ئەو دەنگەی سنوورە دەستکردەکانی رووخاند !

هونەری رەسەن و هونەرمەندی رەسەن زۆر جار بۆتە ناسنامەو کەلتوور و مێژووی نەتەوەکەی ، وەك ئاوێنەیەك و سەرچاوەیەکی مێژوویی هەڵ دەسەنگێندرێت ، لە ئاست بوون و گەڕانەوە بۆ سەرەتای دروست بوونی سیمای هونەری نەتەوەکان ! لە مێژووی هونەری گۆرانی و مۆسیقای نەتەوەی ئێمەش دا زۆر هونەرمەندی رەسەن و گۆرانی رەسەن هەن کە بوونەتە گەواهی ئەم راستییە هەرچەندە هەندێ هۆکار هەبوونە بۆ ئەوەی ئێمە نەتوانین ئەم مێژووە بپارێزین وەك ئەوەی ئێمە خاوەن کیانی سەربەخۆ نەبووینە و هەموو کات دوژمنەکانمان لە بۆسەدا بوونە لە ئاست کلتوور و مێژوو زمانمان بۆ ئەوەی بوونی ئێمە نەمێنێ بە تایبەتیش کاتێ نیشتمانەکەمان کرا بە چوار لەت و هەموو شتێکمان لێ زەوت کراو ئێمەش بووین بە (تورك و فارس و عەرەب) بەتایبەتیش لە رووی زمان و کلتوور و مۆسیقاشی گرتەوە، جگە لەمانەش نەبوونی ئامێر بۆ تۆمار کردنی بەرهەمەکانمان ، بەڵام درێژەپێدەرانی ئەم هونەرە توانیان هەندێ شتمان بپارێزن ئەویش بە بەردەوام بوون و تێکەڵ نەکردنی هونەرەکەمان لەگەڵ هونەری بێگانە ، بەتایبەتیش لەسەرەتای ساڵانی(١٩٠٠)ەوە کاتێ ئامێری تۆمارکردن کەوتە ئەم ناوچانە بۆ گەواهی ئەم راستییەش مێژووی هونەرەکەمان لەم سەدەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ بەهرەی هەست و سۆزی دەنگی چەند هونەرمەندێك لە سەرووی هەموشیان باس لە کارەکانی هونەرمەندی گەورەی کورد(حەسەن زیرەك)ی نەمر دەکرێ ، دیارە زۆر هونەرمەندی تر هەبوون بەر لە زیرەك و لە کاتی زیرەك و دوای زیرەکیش ، بەڵام ئەوەی وامان لێ دەکات کە لە نێو هەموو گفت وگۆیەکی هونەری مۆسیقاو گۆرانی باسی لێوە بکەین ، ئەو دەنگ و ئەدایە بێ وێنە و ئەو کارە جوانانە و بەرهەمە

هونەرییەکانیەتی کە تا ئێستاشی لەگەڵدابێ بوونەتە وێردی سەر زوبانی هەموو کوردێك جگە لەوەی کە خۆی لە کوردستانی لکێندراو بە (ئێران) لە دایك بووە کەچی توانیویەتی بەو دەنگە هەست بزوێنەی سنوورە دەستکردەکانی نێوان هەرچوار پارچەی کوردستان بڕوخێنێ و تا وای لێهاتووە عەرەب و فارس و تورکیش گوێیان لێ گرتووە و سوودیان لە زۆربەی ئاوازەکانی وەرگرتووە و بەشێوەیەکی تر نۆتەکانیان دابەش کردۆتەوە ! حەسەن زیرەك بەراستی ناسنامەی هونەری کوردیمانەو هەقە هەموو کوردێك لە هەر کونجێکی دنیا بێ شانازی بە زیرەکەوە بکات ، چونکە زیرەك بەراستی بەهرە مەندێکی زیرەك بووە و ئەو کارنەی زیرەك ئەنجامی داون پێویستە بخرێنە نێو(تیۆری مۆسیقا)ی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کوردستان و وەك هونەری هونەرمەندانی هەموو دنیا سوود لە کارەکانی پێشوومان وەرگرین جا گرینگ نییە سەدا سەد دووبارە بکرێتەوە چونکە من باوەڕم وایە هیچ هونەرمەندێك ناتوانێ وەك زیرەك بیلێتەوە بەڵام گرنگە وەك (ئەلف و بێ) یەکەی مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) بکرێتە سەرچاوە بۆ سەرەتای فێرکردنی هەموو قوتابییەکی بواری مۆسیقا و گۆرانی و گرنگیشە بگەڕێین بەدوای کۆکردنەوەی ئەرشیفی ئەو هونەرمەندە رەسەنەمان ، چونکە هونەرمەندانی ئێمەش هیچ شتێکیان کەمتر نیە لە هونەرمەندانی نەتەوەکانی ترو زۆر شتیان ئەنجام داوە بۆ نەتەوەی خۆمان ئەوە نییە هونەرمەندی نەمر(حەسەن زیرەك) زیاتر لە (١٧٠٠) گۆرانی بە تۆمارکراوی هەیە جگە لە چەندین ئاهەنگ و دانیشتنی تایبەتی ، جا تۆ بڵێی لە (١٧٠٠) گۆرانی نەتوانین سوود لە (نۆتە و ئەدا و بەرز و نزمی) وەرگرین لەو هەموو هونەرەی زیرەك نواندوویەتی ، کێ بێ لە ئێمە ئێستاش کە گوێی لە گۆرانییەکی (حەسەن زیرەك) ئەبێ هەست بەوە نەکات کە ئەم گۆرانییە وەك ئەوە وابێ کە دوو رۆژ بەر لە ئێستا تۆمارکرابێ ، بۆیە لە یادی (٢٩) ساڵەی کۆچی دوایی (حەسەن زیرەك)ی نەمردا دەڵێم هەقە بەو زیرەکەی نەخوێندەوار بوو بڵێین مامۆستای مێژووی هونەری گۆرانی کوردی.

# حوسێن عەلی دەنگێکی هەمیشە زیندوو

لە ١٩٩١\٧\١٨ هونەرمەندی بە توانای گەلەکەمان (حوسێن عەلی) لە تەمەنی (٦٦) ساڵی کۆچی دوای کردووە و هونەرمەندێکی دەنگ ناسك و شارەزایەکی باشی بواری مقاماتی کوردی بووەو وەك (ئای ئای و خورشیدی و حیجازو شوور قەتارو ئەڵلاوەیسی)و بەستەو گۆرانی کە لە زۆر مقامات و گۆرانیەکانی دەچێتەوە پاڵ دەنگە بەسۆزو نەمرەکەی مامۆستای هونەرمەند (عەلی مەردان) گومان لەوەشدا نیە کە هەموومان دەزانین مەقام و حەیران دوو بنچینەی سەرەکین بۆ فێر بوونی گۆرانی لە نێو هونەری ئێمەدا ، چونکە دەنگ و ئەدای هونەرمەند لەم دوو رێچکەیەوە بەدیار دەکەوێت ئینجا بۆ گۆرانی و بەستەی شادی (حوسێن عەلی ) گۆرانی بێژوو مەقام زانێکی بەتوانای ناوچەی گەرمیان بووەو چەندین هونەرمەندی تری ئەو ناوچەیە خولیای دەنگە بەسۆزەکەی بۆتە هاندەریان و لێوەی فێرە چۆنیەتی هونەری رەسەنی میللەتەکەمان بوونە ،کێ بێ لە ئێمەش کاتێ گوێی لە دەنگە بەسۆزەکەی ئەو هونەرمەندە دەبێ نەچێتەوە دونیایەکی قوڵ و چەندین ئاە و هەناسە بۆ رۆژانی تەمەنی هەڵنەدات و تێکەڵ بە ووشە ناسك و پڕ ماناکانی نێو مقام و گۆرانیو بەستەکانی نەبێ و بەرەو ژیانی کوردەواری شۆرنەکاتەوە (حوسێن عەلی) هونەرمەندی جوان پەرست لە گۆرانیەکانی رەنگ دانەوەیەکی ئێجگار جوانی تیا بەدی دەکرێ لەسەر ژیان و جوانی ئافرەتی کوردەواری ،دیارە (حوسێن عەلی) ئەمریش وەکو زۆربەی گۆرانی بێژەکانی ترمان لارولەنجەو جوانی قەدو بالاو گەردەن بلوری ئافرەت بوونەتە هەوێنی گۆرانیەکانی و بۆ ئەتەوەکەشی وەك ئەرشیفێکی مێژووی هونەریمان بمێنێتەوە و سودی لێوەرگرین ، ئەوەتا زۆربەی گۆرانیەکانی تا ئێستاشی لەگەڵدابێ بوونەتە وێردی سەرزاری زۆربەمان و چەندین گۆرانی بێژیش هەوڵی دووبارە کردنەوەیان داوە ،بەلام نەیان توانیوە

بگەنە ئاستی ئەم هونەرمەندە ، دیارترین گۆرانیەکانیشی کە مۆرکێکی نەتەوەیان پێوەدیارە وەکو (تەنکەگیانم تەنکە ، پاوانەکانی ، دانەدانە، نیەلەماڵ ونیەلەماڵ ، باڵا گەردان ، لەملان ولەملانی کەم ، کوڵان بەکوڵان ، ئامین و ئامین ، نازدارو نازەنینە ،گیانەکەم بۆتۆ، کراس زەردێ بزمارەو بزمارە، ناوێرم ، ئەمبەر ئەوبەرە، مەقامی نیوەشەوە) و چەندین مەقام و بەرهەمی تر ، هونەرلە وڵاتاندا ئالآیەکی دیارو شەکاوەیە بۆ ناساندن و بوونی نەتەوە ! بەڵام بە داخەوە ئێمە کەمتەرخەمین لەم رووە وە بۆیە تا ئێستاش نەمان توانیوە بەرهەمی هونەرمەندانمان کۆ بکەینەوەو لە نێوەندە راگەیاندنەکانمان سودیان زیاتر لێ وەربگرین ، نمونەی ئەوانیش زۆرن بەڵام هونەرمەند(حوسێن عەلی) زۆر بەکەمی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی خۆمان دەربارەیان نووسیوە و زانیاریان لەسەر بڵاوکردۆتەوە, بەڵکو ساڵەو ساڵیش تەنیا بۆ یادکرنەوەش شتێکیان نەخستۆتە سەر لاپەڕەی رۆژنامەکان و بەرنامەی TV و رادیۆکان, کە دڵنیام یەکە یەکەی نۆتەی ئاوازەکانی دەبنە بنەرەتێکی زیندوو بۆ هونەرەکەمان و پێویستە بەرهەمەکانی بخرێتە نێو(تیۆرەکانی مۆسیقا)ی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کوردستانەوە ! چونکە عەلی مەردان و حوسێن عەلی و حەسەن زیرەك و تاهیر تۆفیق و محەمەدی مامڵێ و سەدانی تری وەك ئەوان ناسنامەو رەسەنایەتی هونەری ئێمەن و هونەرەکەمان بەدەنگی ئەوانەوە دەناسرێتەوە نەك بە بتهۆڤن و بیرلۆزو مۆزات ! بۆیە دەکرێ وەزارەتی رۆشنبیری و بەرێوبەرایەتی هونەری مۆسیقاو گۆرانی هەوڵی کۆکردنەوەی بەرهەمە هونەرەکانیان و ژیاننامەکانیان بدەن و بە چاپیان بگەیەنن هاوکارییەکی باشی هونەر دۆستان و بنەماڵەکانیشیان دەست پێشخەربێ بۆ ئەم ئەرکە پیرۆزە.

# ئەو گوڵەی مەشهووری گشت عالەم بوو کوا یادی بەخێر

وەکو دەوترێ هونەری راستەقینە رەنگدانەوەی سیمای نەتەوایەتییە و گوزارشت لە خواست و ئارەزووەکانی میللەت دەکات ، بەڵام ئەو هونەرەش چ وێنەکێشان ، شانۆ، مۆسیقا و گۆرانی گەر هاوکارێك نەبێت بەراستەقینە و دروستی و بەرپرسیارێتی لە دوارۆژ بەرامبەر بە هونەرەکە کاری لەتەکدا بکات بێگومان ئەو هونەرە ون دەبێ و شوێنەواری نامێنێ لە نێو نەتەوەکان ، هونەری مۆسیقا و گۆرانیش وەکو هەموو شێوە هونەرییەکانی تر لە نێو کورددا لە کۆنەوە سەری هەڵداوە و ساناترین هونەریشی کە خەڵکی بە زۆری گوێی لێبگرن و بەباشیش لە وتەو مانا و نیازەکانی حاڵی بن ، بە تایبەتیش گەر بە دەنگێکی پڕ لە بەهرەو ئەدای پڕ لە سۆز و نۆتەی ئاوازی رەسەنی کوردی بێ چۆن ئەو مرۆڤەی گوێبیست بێ دلگیر و سەودا سەر نابێ ، ئەو دەنگانەش زۆرن کە خزمەتێکی باشیان لەم بوارەدا کردووە و جێگایان دیارە ! یەکێ لەو بەهرەمەندانەش دەنگ و چریکەی پڕ لە ژانی هونەرمەندی پایە بەرزی کورد و خۆشەویستی سەرجەم عاشقان و جوان پەرست و هەوادارانی هونەری راستەقینەی کورد(محەمەدی ماملێ)یە .

هونەرمەندی کۆچکردوو (محەمەدی ماملێ)ی نەمر گەورەترین و بەتەمەنترین هونەرمەندی کورد بوو کە لە ساڵانی سییەکانەوە دەستی بە گۆرانی وتن کردبێ و تاکە هونەرمەندیش بوو کە تا ساڵی ١٩٩٩ لە ژیاندا مابوو ، (ماملێ) لە ساڵی (١٩٢٥) لەگەرەکی (خرپێی) کۆمارە تەمەن کورتەکەی شاری (مەهاباد) لە دایك بووە و جوانی و سروشتی وڵات و لەنجەو لاری کچانی شارۆچکەو دەنگە بەسۆزەکەی (سەعید)ی باوکی کە یەکێ بووە لە دەنگ خۆش و ناسراوەکانی ناوچەی (موکریان)و هاندانی دەنگی(حوسێن)ی برای کە ئەویش یەکێ بووە لە گۆرانیبێژە ناسراوەکانی ئەم ناوچەیە کاریان کردۆتە سەر (محەمەدی ماملێ)ی دەنگ ناسك کە

ببێ بە گۆرانیبێژو لە ساڵی (١٩٣٨) یەكەم گۆرانی بە دەنگی خۆی تۆمار بكات بەناوی (لاوە هەی لاوە)، مامڵێی تازە لاو و جوان پەرست و عاشق ، دڵ و دەروونی خۆی بە گۆرانی وتن دەكاتەوەو لە جیاتی عاشقانی شەرمن دەنگ هەڵدەبڕێ و دەڵێ:

ئەو گوڵەی مەشهووری گشت عالەم بوو كوا یادی بەخێر

مەیلی وی دەرمانی دەردی من بوو كوا یادی بەخێر

چۆن دەبێ فیكرت نەبێ تیرت لە جەرگم كارییە

ئەو دەمەی بوومە نیشانەی تیری تۆ یادت بەخێر

بای شەماڵ بیدا بە دەست ئەو دولبەرە هاوارم

مەرهەمێكم بۆ بنێری بۆ دڵەكەی زامدارم

بەڵێ زۆرن ئەوانەی خزمەتی هونەری كوردییان كردووە ، بەلام ئەوانەی روحی هونەری كوردی بوونە ، ئەوانەی ئەرشیفی هونەری نەتەوەكەیان لە نێو سینگیاندا پاراستووە و نەوە بۆ نەوە دیگێرنەوە كەمن و بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن ، مامڵێی نەمر یەكێكە لە وانەی كە هونەری مۆسیقا و گۆرانی سینگاو سینگ گواستۆتەوە بۆ گوێچكەی هونەردۆستان، مامڵێی نەمر نە مامۆستایەكی زمانەوانی بوو ، نە مامۆستایەكی بواری مۆسیقا بوو ، مامڵێی نەمر تەنیا تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی دەخوێنێ و لەبەر نەبوونی و هەژاری رۆژگار دڵی مامڵێ سارد دەكات كە واز لە خوێندن بێنێت و بە كۆچی ناوادەی (سەعیدی مام عەلی) باوكیشی لە ساڵی(١٩٤١) مامڵێی تازە لاو ئەركێكی قورستری دەكەوێتە سەرشان ئەویش بەخێو كردنی دایك و براو خوشكەكانیەتی ، مامڵێی نەمر دوای گوزەرانێكی ناخۆش و ژیانێكی پڕ لە بێ ئومێدی پەنا دەباتەوە بەر گۆرانی وتن كە وەك پیشەیەك بۆ بەخێو كردنی خێزان و لە هەمان كاتدا وەك خزمەتێك بە هونەری بنەماڵەكەیان كە خۆی دەڵێ (هەم توانیم خزمەتێك بە زیندوو كردنەوەی گۆرانییەكانی (سەعید)ی باوكم بكەم ، چونكە گۆرانییەكانی باوكم دەچڕیەوە هەم بۆ بەخێو كردنی خێزانەكەمان) مامڵێی نەمر وەنەبێ تەنیا لە پێناو پارەدا ئەم كارەی كردبێ

! نەخێر ماملێ یان دەبوایە یەکجارەکی واز لە هونەری بنەماڵەکەیان بهێنێ یان ئەوەتا دەبوایە یەکجارەکی بۆ هونەر خۆی تەرخان بکات ، ئەوە بوو ماملێ لەم رووەوە سەرکەوتوو بوو و جگە لە گۆرانییەکانی باوکی چەندین گۆرانی تازەشی لە شیعرەکانی شاعیرانی گەرەوەی کورد(وەفایی و هێمن و هەژار و کامیل وهۆنراوە فۆلکلۆرییەکان و چەندین هۆنراوەی کە خۆشی دینووسی) دەکاتە هەوێنی بەستە و گۆرانی ، جا کێ بێ لە ئێمە گوێی لە ناڵەی ماملێ نەبێ کە بەقورگێکی پڕ لە گریانەوە دەڵێ :

شەوە دونیا وەکو زولفت سیاپۆش
وەرە با دەردی دڵ بکرێت فەرامۆش
دەستم دەستۆت کە بابتگرمە باوەش
ئەگەر مردم لە خۆشیا چاوی تۆ خۆش

ماملێی نەمر هەر بەوە نەوەستاوە کە تەنیا گۆرانی بۆ جوانی ئافرەت بڵێ ، بەڵکو لە سەردەمی دامەزراندنی کۆمارە ساوەکەی (مەهاباد) چەندین سروودی نیشتمانی و شۆرشگێری وتوە لەوانەش (ئەی رەقیب و خوایە وەتەن ئاواکەی) چەندین جاریش لەلایەن دەسەلاتدارانی ئێرانەوە گیراوە چونکە وەکو کوردێك داکۆکی لە وڵات و مافی نەتەوەیی خۆی کردووە لەم بارەشدا کورێکی شەهید بووە . دوای زیاتر لە نیو سەدە خزمەتکردنی هونەری مۆسیقا و گۆرانی کە یەکەم بەرهەمی لە ساڵی (١٩٣٨) تۆمار کردووە و ، دوایین بەرهەمیشی کە لە ساڵی(١٩٩١) بە هاوکاری چەندین هونەرمەندی کوردستانی باشور تۆمار کرد لەوانەش هونەرمەندی کۆچکردوو (دڵزار یاسین مەحموری بەکەمانچە) هونەرمەندی گۆرانیبێژ (عەدنان کەریم بە عود)،(سەرتیپ ئەحمەد بە فلوت) و چەند ئامێر ژەنێکی تر لەشاری مەهاباد، بەداخەوە ماملێی نەمر لە رێکەوتی ١٩٩٩/١/٢٣ دوای تەمەنی (٧٤) ساڵی دڵە گەورە و پڕ لە هیوا و ئومێدەکەی لەشاری (مەهاباد) لە لێدان دەکەوێ و رۆژی دوایی کە دەکاتە ١٩٩٩/١/٢٤ لە گۆڕستانی (بوداخ سوڵتان)ی شاری (مەهاباد) لە تەك شاعیران (هێمن و هەژار)

دەنێـژرێ و بـەم کۆچـەی مـاملێی نـەمر کـە لێنێکـی ئێجگـار گـەورەش کەوتـە نێـو هونەری کوردیمان و پڕ کردنەوەشی زۆر ئەستەمە . چونکە مـاملێ قوتابخانەیـەکی سەربەخۆی ئەم بوارە بوو بۆ میللەتەکەمان ، بۆیە دەگرێ سوود لە ئاواز و نۆتەکانی وەربگیرێ و تێکەڵ بە (تیۆرەکانی مۆسیقا)ی پـەیمانگای هونـەرە جوانـەکان بکـرێ و ئاواتە خوازم وەزارەتی رۆشنبیری وەکو رێزلێنانێك بۆ تەمەنی پڕ لە شـکۆی مـاملێی نەمر پەیکەرێکی بۆ بکا و لەبەردەم پەیمانگای هونەرە جوانەکان دابنرێ ، لێرەوەش دەڵێم مـاملێ نـامرێ ! مـن دڵنیـام ماملـێ و هونـەری مـاملێ لـە نێـو دڵـی هـەموو عاشقاندا دەژی، بەڵام ئەفسوس زەمانە گوڵێکی داینێ و لێی ستاندین .

# لەیادی ٢٥ ساڵەی کۆچی دوایی حەسەن حەیراندا
# ئەستێرەی درەوشاوەی هونەری فۆلکلۆری کوردی

لە نێو هەموو میللەتێکدا مرۆڤ گەر زیاد لەپێویست هەستی بەجوانی سروشت و لەنجەو لاری کچانی گۆزە لەشان و ئێوارانی شەنگە بێری و نازی گەورە کچان و ئاوە سازگار و تەزیوەکەی کانیاوەکان کرد ، ئەوا یان دەبێت بە هونەرمەند بەتایبەتیش هونەری گۆرانی وتن, یان دەبێ بەشاعیرێکی جوان پەرست ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ بەپێچەوانەوە هەستی بەچەوسانەوەو نایەکسانی و خاك زەوتکردن کرد لەبەردەم واقیعەکانی رۆژگار, ئەوە مرۆڤێکی شۆڕشگێڕو خاوەن ویژدان و خاك پەروەری لێ بەدی دەکرێت ، مەبەستم ئەوە نییە کە مرۆڤەکانی دیکەی نێو کۆمەڵگا ملکەچی هەموو بڕیار و راسپاردە و فشارەکانی دەسەڵات بن و هەستی نیشتمان پەروەری و نەتەوەییان لاواز بێت ، بەڵام گومان لەوەدانییە ئەوەی زیاتر هەست بەنازارەکان بکات یان جوانتر و گەشبینانەتر بڕوانێتە ژیان و ئاییندە ئەوا بەهرە و تواناکانی ئەو مرۆڤە لەهەندێك بواردا زیاترە لە مرۆڤەکانی تر ، زۆرجاریش ئەم سێ بەهرە و توانایە واتە (هونەرمەند و شاعیرو تێکۆشەر) لەکەسانێکدا کۆبوونەتەوە و هەم بەچەك و پێشمەرگایەتی خەباتی کردووە هەم لەرووی نوسینی شیعر و گۆرانی وتن وسرودی نیشتمانی و شۆڕشگێڕی رۆڵی بەرچاوی هەبووە, کەچی بەداخەوە ئەو مرۆڤە و بەهرەمەند و بەتوانایانە لەدوای مردنیان بەماوەیەکی کەم لە یادمان دەچنەوە ! تەنیا گۆرانی بێژانمان نەبێ جارجارە لە رادیۆکاندا گوێمان لە دەنگە بەسۆزەکانیان دەبێت.

لە ٧/١٧ یادی کۆچی دوایی هونەرمەندێکی بواری گۆرانی فۆلکلۆری ناسراوی کوردیمان دەکەینەوە کە تائێستاشی لەگەڵدابێ بۆتە بەشێك لە ئەرشیفی حەیران بۆ هونەرەکەمان و توانیویەتی گەنجینەی هونەری رەسەنی کوردی لە فەوتان بپارێزێت ئەم هونەرمەندەش (حەسەن حەیران)ە

<u>چەند تیشکێك لەژیانی هونەری (حەسەن حەیران)</u>

حەسەن حەیران وەك هونەرمەندێك بەتوانای بواری حەیران و لاوك کەس نیە لەدەشتی هەولێر و کوردستان بەگشتی گوێی لەو دەنگە بەسۆزەی نەبووبێ کاتێ بە حەیرانە خۆشەکانی گەشتێك دەکاتە نێو یەکە بە یەکەی گوند و دەشت و چیاو مەزارگە و کانی و خێڵ و رەوەندان و وەسف کردنی جوانی و لەنجەولارو پیا هەڵدانی ئافرەتانی تیرە و ناوچەکانمان پێ دەناسێنێ کە بەئاواتەوە بین رۆژێ لەرۆژان رێگەمان بکەوێتە ئەم شوێن و مەزارگایانەی کە حەیرانەکانی(حەسەن حەیران) رووە و ئەم هەوارەمان دەبات .

حەسەن حەیران لە ساڵی ١٩٣٧ لە گوندی (تەلەرخێمی گەورە)ی سەر بەناحیەی گوێری قەزای مەخمور لەدایك بووە ناوی تەواوی (حەسەن قادر خلیل)ە ، لەبنەماڵەیەکی جوتیار گەورەبووە و تەمەنی لاوێتی بەشوانی و جوتیاری لەدەشتە کاکی بەکاکیەکەی قەراج و کەندێناوە و شاخە خۆراگرەکەی قەرەچوغ بەسەر بردووە و ئاو و هەواو سروشتی ئەو ناوچەیە و حەیران بێژان و لاوك بێژانی ناوچەکە هاندەرێکی باش بوونە بۆ فێربوونی حەیران حەسەن حەیران جگە لەوەی حەیران بێژ بووە ساڵانێکی زۆریش لە نێو ریزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بەرگری لە خاك و نەتەوەکەی کردوە بۆ رزگار بوون لە دەست جەورو ستەمی رژێمی فاشی بەعس ، هەروەها شمشاڵ ژەنێکی باشیش بووە و لەگەرووی شمشاڵەکەیەوە جۆش وخرۆشی دەشتە کاکی بەکاکیەکەی قەراج و کەندێناوەی دەهێنانە سەما ، شارەزای حەسەن حەیران لە هونەری شمشاڵ ژەنین بەبڕوای من ئەگەر تەمەنی زیاتر بوایە هیچی کەمتر نەبوو لە هونەرمەندی کۆچ کردووی شمشاڵ ژەن (قالە مەڕە) بۆ راستی ئەم قسەیەشم دەتوانین گوێ لە حەیرانەکانی خۆی بگرین کە هەر خۆشی دوای گوتنی هەر کۆپلەیەکی حەیران شمشاڵ دەژەنی و دونیایەك لە جوانی و بەهرەی ئەو نەمرەمان بۆ دەردەکەوێت !

هونەرمەندی میللی (حەسەن حەیران) جگە لەوەی لەنێو کوردستانی باشوردا بەتایبەتیش دەشتی هەولێر ناسراوە و عاشقانی حەیران و فۆلکلۆری کوردی بەمامۆستای حەیرانی دەزانن و لە کوردستانی رۆژهەڵاتیش جەماوەرێکی ئێجگار زۆر بەدەنگە سیحراویەکەی سەرسامن لەوانەش لە چەند دیمانەیەکدا لەگەڵ

هونەرمەنـدی کـۆچ کـردوو (محەمـەدی مـاملێ) کـە پرسـیاری دەربـارەی (حـەیران) لێدەکرا دەیوت (حەیران تەنیا بەدەنگی حەسەن حەیران کاری گەری هەیـە لەسەر مرۆڤ کەمن یەکێکم لە شەیدایانی دەنگی بەراستی تەنیا خۆی دەتوانێ ئـاوا حـەیران بڵێ) .

هـەروەها هونەرمەنـدی دەنـگ خـۆش و بەئـەزموون (عـەزیزی شـارۆخی) دەربـارەی حەسەن حەیران دەڵێ " حەسەن حەیران تاکە هونەرمەندە کە ئاوا بتوانێ حـەیران بچریکێنێ و فۆلکلۆری دۆستانی نەتەوەکەمان بهەژێنێ) جگە لـەم دوو هونەرمەنـدە مەزنە بەدەیان هونەرمەند و گۆرانی بێژی تر کـەباس لـە دونیـای حـەیران دەکرێـت ئـەوا (حەسـەن حـەیران) بەسـەر مەشق و تاکـە حـەیران بێـژی میللـی دادەنـێن کـە بەشێوەیەکی زۆرباش گوێگر تێکەڵ بەجوانی و سروشتی کوردستان دەکات ، حەیران بێژی میللی حەسـەن حـەیران دوای شکستی شۆرشـی ئـەیلول لـە سـاڵی ١٩٧٥ ئـەویش وەك سـەدان خێزانـی تـر بـەرەو وڵاتـی ئێـران دەچـێت و لـەوێش جگـە لەهەسـتی نیشتمانی و نەتەوایەتی کە بۆتـە هانـدەری زیـاتر بـۆ پەرەپێدانی هونەرەکـەی ئـەوا دووری لەزێدی بـابو و بـاپیرانی و غوربـەتی خـەمێکی گەورەی ئـەم حـەیران بێـژ و تێکۆشەرە بووە ، بەداخەوە حەسەن حەیرانی نەمر هـەر لـەئاوارەی و دوور لەزێـدی خـــۆی لـــە رێکـــەوتی ١٩٨٤/٧/١٨ بەکارەســـاتی ئۆتۆمبێـــل لـــە نێـــوان شـــاری (نەغـــەدە)و(ورمـــێ)ی رۆژهـــەڵاتی کوردســـتان کۆچـــی دوایـــی دەکـــات و ســـاڵی ١٩٩٠ تەرمەکـەی دەگەڕێننـــەوە بـۆ ئـەو گونـدەی کەتیایـدا فێـری خۆشەویـستی وڵات و نیـشتمانپەروەری و هونـەری رەسـەن بـوو ! حەسـەن حـەیران لەژیانیـدا دوو ژنـی هێناوە و نەوەی هەر دوو ژنەکەی لەشاری هـەولێر دادەنیـشن ، هەنـدێ سەرچاوە و نووسـین ئامـاژە بـەوەدەدەن کـە هونەرمەنـد حەسـەن حـەیران لـە ١٩٨٤/٧/١٧ کوچـی دوایی کردووە هەندێکیش دەڵێن لە ١٩٨٤/٧/١٨ جگە لەمـەش بـاس لـەوە دەکرێـت کـە حەسـەن حـەیران پێـنج کاسـێتی تۆمـارکراوی هەیـە بـەڵام تائێـستا یـەك کاسـێتی بڵاوکراوەتەوە و کەوتۆتە بەر گوێی فۆلکلۆر دۆستان ! هیـوادارم کەسـانی نزیـك لـە خانـــەوادە و کورەکـــانی راســـتی رێکـــەوتی رووداوی کـــۆچ کردنەکـــەو هۆکـــاری بڵاونەکردنەوەی کاسێتەکانی تری لە لاپەرەی رۆژنامەکان بڵاوبکەنەوە .

## قادر دیلان

## ئەستێرەیەکی درەوشاوەی هونەری کوردیو شیوعییەکی داهێنەر بوو

هونەرمەند قادر دیلان لەکۆتایی سالآنی بیستەکان لەشاری سلێمانی لەدایك بووە، یەکەم کەس بووە کە ئامێری (کلارنێت)ی لەکوردستان بەکارهێناوە، یەکەم کەس بووە تیپی مۆسیقای کوردی بەناوی (مەولەوی) لەساڵی (١٩٥١) دامەزراندووە یەکەم هونەرمەندی کورد بووە کە بەشێوەیەکی ئەکادیمی بۆتە مامۆستای دابەشکردنی مۆسیقا وانە (کۆمپۆنیست)، یەکەم کەس بووە کە قوتابخانەی سەمفۆنیای کوردی دامەزراندووە، یەکەم کەس بووە کە ئاوازی بۆ سرودی ئەمڕۆژی ساڵی تازمیە نەورۆز هاتەوە داناوە، شارەزاییەکی باشی لەژەنیننی ئەم ئامێرانە ( عود، کەمانچە، نای، کلارنێت، شمشاڵ، ساکسیفۆن، فلوت،پیانۆ) هەبوو ئەوا بڕوانامەکەشی لەزانکۆی (کۆنسەر ڤاتۆری کارلۆڤۆ)ی چیکوسلۆڤاکیای ئەوسا بەپلەی نایاب لەئامێری فلوتو پیانۆ وەرگرتو لەبەر لێهاتوویی کرایە ئەندامی ئۆرکسترای ئەو ولآتە، لەساڵی (١٩٥١) پەیوەندی بەحزبی شیوعی عێراق کردوە تا ڕۆژی کۆچی دوایی ١٨ / ٣ / ١٩٩٩ ئەم هونەرمەندە بلیمەتە جگە لەو هەموو کارەی بۆ نەتەوەکەمانی ئەنجام داوە چەندین کاری هونەری بۆ ولآتانی (چیکوسلۆڤاکیاو بولگاریاو پۆلۆنیا) ئەنجام داوەو زیاتر لە (٢٠)ساڵ لەرادیۆی پراگ وەك مۆسیقاژەن کاری کردووە ، زیاتر لە نیو سەدە واتە (٥٠) ساڵ زیاتر خزمەتی گۆرانیو مۆسیقای کوردی کردووە بۆیە لەساڵیادی ئەم پیاوە مەزنەدا چەند لاپەڕەیەکی شاراوە لەژیانی ئەم نەمرە تۆمار دەکەین بۆ دڵسۆزانی بواری هونەری مۆسیقاو گۆرانی کوردی کە دونیایەکی بەرفراوانە! کەم کەس توانیویانە لەم بوارەدا ئەسپی خۆیان تاودەن و بگەنە لوتکە! دەتوانم بڵێم ئەو هونەرمەندانەی لەکوردستانی باشوور گەیشتونەتە لوتکەی ئەم هونەرە بەپەنجەی دەستان دەژمێردرێن! بۆیە جێگای خۆیەتی هونەردۆستانو وەزارەتی ڕۆشنبیری بڕۆزدیان هەبێت بۆ تۆمارکردنی ژیانو کارە هونەرییەکانی ئەو هونەرمەندە

ڕەسەنانە لەپەرتوکێك بۆ ئەوەی بەنەوەی ئایندەی خۆمان بڵێین ئەوانە بتهۆفن و مۆزارت و... ئێمەن.

هونەرمەندی کۆچکردوو (قادر دیلان) لە ٢٤ / ٥ / ١٩٢٨ لەگەڕەکی (گاوان)ی شاری سلێمانی لەدایك بووە، کوڕی (ئەحمەد دیلان)ی گۆرانی بێژو برای (سالح ئەحمەد دیلان)ی شاعیرو گۆرانی بێژی گەورەی کوردە، دیارە قادر دیلانی نەمریش وەکو هونەرمەندی گەورەی کۆچکردوو (محەمەدی ماملێ) لە باوکییەوە فێری گۆرانی وتن بووە، دیلانی نەمر لەنێو خێزانێکی کوردپەروەرو هونەرمەند گەورە دەبێت، بۆیە لەدەنگی باوکی و (سالح دیلان)ی برا گەورەی فێرە گۆرانی و ئاوازی ڕەسەنی کوردی بوووەو کاریگەریەکی باشیان لەسەر قادر دیلان هەبووە. ئەمەش وای لەدیلان کردووە زیاتر تێکەڵی ئەم هونەرەبێت بەتایبەتیش کاتی وەك (کلارنێت) ژەنێك لە قوتابخانەی دواناوەندی بەدەرکەوت و لەگەرووی کلارنێتەکەیەوە خواستەکانی خۆی بەگوێی دڵسۆزانی ئاشنا دەکرد.

قادر دیلانی نەمر خۆی ئاماژەی بەوە داوە لەدیدارەکانی کە هەر لەقۆناغی سەرەتاییەوە زۆر سەرسام بووە بەکەسایەتی مامۆستا (عەبدولواحید نوری) بۆیە هەر لەرێگای ئەویشەوە لەساڵی (١٩٥١) پەیوەندی بەحزبی شیوعی عێراقەوە دەکات و هەر لەو کاتەوەش لەگەڵ دامەزراندنی رێکخراوی یەکێتی لاوانی دیموکراتی عێراق رۆڵێکی بەرچاوی دەبێت و پاشان دەبێتە بەرپرسی شاری سلێمانی یەکێتی لاوانی دیموکراتی عێراق کە ئەم رێکخراوە لەلایەن حشع دامەزرا بۆ هاندان و رێکخستنی توانای گەنجەکان، دیلانی نەمر لەساڵی ١٩٤٨ ئاوازی ئەمرۆژی ساڵی تازەیە نەورۆز هاتەوە بۆ ساڵح دیلانی برای دادەنێت کە یەکێکە لە گۆرانیە هەست بزوێنەکانی ئەو کاتەو ئەمرۆشمان.

قادر دیلانی نەمر بۆ تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندن لەکۆلێژی بازرگانی بەغدا وەردەگیرێت، بەڵام بەداخەوە لەبەر خراپی باری دارایی خۆی و خێزانەکەی و لەبەر گرتنی (سالح دیلانی) برا گەورەی نەیتوانی ئەم کۆلێژە تەواو بکات و گەڕایەوە شاری

سلێمانیو پاشان وەك فەرمانبەری میری لەفەرمانگەی (ئیداری محەلی) دامەزراوە ساڵی (١٩٤٥) دیلان لەبەر لێهاتووییو رۆڵی لەبۆنە نیشمانیو نەتەوایەتیەکان بیر لەوە دەکاتەوە کە تیپێکی مۆسیقا پێکبهێنێ بۆیە لەساڵی ١٩٤٦ تیپی (دیلان)یان پێکهێنا پاشان هەر ئەم تیپە بوو بەتیپی (مەولەوی)، دیلانی شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەر جگە لەوەی وەك مۆسیقاژەنێك بەدەرکەوت لەهەمان کاتدا وەك ئاوازدانەرو گۆرانی بێژو شانۆکارو رۆڵی هەبووە بەشداری چەند شانۆگەریەکی کردووە لەوانەش (لەرێی نیشتماندا ساڵی ١٩٤٦، تاوانی چی بوو ساڵی ١٩٥١، مەمو زین ١٩٥٨ ).

دیلانی نەمر هەر بەوەندەش نەوەستاوەو بەڵکو ماوەیەکی باشیش لەئێزگەی بەغدا بەشی کوردی کاری کردووەو هەر لەوێشدا یارمەتی چەندان گۆرانی بێژی داوە وەك ژەنینی ئامێری کلارنێتو ئاوازدانەرو دابەشکردنی مۆسیقا نمونەی بەرچاویش مقامەکانی (سێوە)ی نەمر "ئەوەل سەحەرە" ئایشەگوڵ"و "ئەرێ گوری"و "ئەوە پایزە"، دیلانی شیوعیو نیشتمان پەروەر لەکاتی لافاوەکەی شاری سلێمانی لەساڵی (١٩٥٧) رۆڵێکی باشی دەبێت بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ لێقەوماوانی ئەم کارەساتە بۆیە لەرێگەی هونەرەکەیەوە شار بەشاری کوردستان گەڕاوەو ئاهەنگی ساز کردووەو پارەی ئاهەنگەکەشیان داوەتە ئەو لێقەوماوانە، لەهەمان کاتدا دیلانی نەمر لەرۆژنامەی (ژین)ی ئەوکاتەی پیرەمێردی نەمر ستونێکی هونەری هەبوو کە تیایدا ئاماژەی بەبواری هونەری دەکرد لە کوردستانو عێراق.

گومانی تیا نییە هەر کەسێ گوێی لەکارە هونەرییەکانی مامۆستا قادر دیلان بێ ئەو راستییە دەزانێت کە هونەرمەندێکی دەنگ خۆشو مۆسیقاژەنێکی بەتواناو ئاواز دانەرێکی شارەزابووە ، لەگۆرانی و مۆسیقاکانیدا هەست بەتامو چێژێکی ژیانی میللیو نیشتمانیو نەتەوەییو شۆڕشگێڕی دەکرێو هەردەم خۆی پاراستووە لەلاسایی کردنەوەی گۆرانیو مۆسیقای هونەرمەندێکی ترو مۆسیقاو ئاوازی نەتەوەیەکی تر،قادر دیلانی نەمر سەرەڕای ئەم هەموو بەهرە هونەرییەی وەك مۆسیقاژەنو شانۆکارو گۆرانی بێژوو نووسەرو ئاوازدانەر رۆڵێکی باڵاشی هەبووە لە

مەیدانی سیاسەت و تێکۆشان لە پێناو ئاشتی و ئازادی و یەکسانی و دیموکراسی و سۆسیالیزم و فرەمانێکی گیان بەخت کردوو بووە لەتەمەنی دوورو درێژی پڕ شکۆی لەنێو ریزەکانی حزبی شیوعی عێراق و هەردەم بەدڵ و گیان و قەڵەم و هونەرەکەی خەباتی دەکرد بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی لە چەوسانەوەو ژێردەستەیی بۆیە لەیادی دامەزراندنی حزبی شیوعی عێراقدا بەبڕوایەکی پۆڵایینەوە بەتواناترین سروودی بۆ حزبەکەی چڕی لەپێناو نیشتمانێکی ئازادو گەلێکی بەختیار .

هەموو کات دیلانی نەمر هەوڵی دەدا بەتیشکی سوسیالیزم بە بیری نوێی چینایەتی و نەتەوایەتی وڵاتەکەی بکاتە چراخان، دیلانی هونەرمەندو کوردپەروەر بۆ تەواوکردنی خوێندنی ئەکادیمی کوردستانی دایك و عێراق جێ دێڵێ و لە ٤ / ٦ / ١٩٦١ بەرەو وڵاتی (چیکۆسلۆڤاکیای) ئەوسا دەچێت و لەزانکۆی (کۆنسەرڤاتۆری کارلۆڤۆ) وەردەگیرێت و بۆ ماوەی چوار ساڵ خەریکی خوێندنی مۆسیقا دەبێت و بڕوانامەی بەپلەی نایاب لەئامێری (فلوت و پیانۆ) بەدەست دەهێنێ و هەر لەبەر ئاستی بەرزی و بەتوانایی دەبێتە ئەندامی ئۆرکسترای ئەو وڵاتە لەهەمان کاتدا بۆ ماوەی بیست ساڵ لەرادیۆی پراگ خەریکی مۆسیقا دەبێت و لەبەشی عەرەبیش کار دەکات هەر لەوێش چەند گۆرانیەکی خۆی تۆمار دەکات.

دیلانی شۆڕشگێڕو شیوعی و نیشتمان پەروەر لەئاوارەیی و غوربەتیشدا بەرۆحێکی پڕ لەناڵەی غەریبی و بەئومێدێکی زۆرەوە لاوانەوەی بۆ وڵاتە جوانەکەی و زامی هەڵەبجەی شەهید گوتووە.

دیلانی نەمر هەر لەوڵاتی چیکوسلۆڤاکیا ژیانی هاوسەری پێکدێنێ و کوڕێك و کچێکیان دەبێت (ئارام) کە ئەویش مۆسیقاژەنێکی بەتوانایە و کچەکەشی ناوی (بارونکە).

دیلانی شۆڕشگێڕ لە وکاتەوەی لەزانکۆ دەبێت و دوای تەواوکردنی زانکۆش رۆڵێکی دیارو بەرچاوی هەبووە لەرێکخستنی قوتابیانی هەر چوار پارچەی کوردستان

لەرێکخراوی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد) لەئەوروپاو چەندین ساڵ لەسکرتاریەتی باڵای ئەم رێکخراوە کاری کردووە گروتینێکی ئێجگار زۆری بەم رێکخراوە داوە بەتایبەتیش لەکاتی یادە خۆش و ناخۆشەکانی نیشتمانی و نەتەوایەتیمان بەرێپێوان و مان گرتن و کاری هونەری و لەهەمان کاتدا رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لەکۆنگرەو کۆنفرانس و یەکگرتنەوەی ئەم رێکخراوە! هەر ئەم رێکخراوەش بلاوکراوەیەکی دەر دەکرد بەناوی (گۆڤاری کوردستان) کە ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵە بوو دیلانی نەمر بەنووسینی هونەری و نیشتمان پەروەری رۆڵێکی باڵای هەبوو لەم گۆڤارە ، ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەکارە دیارو بەرچاوەکانی دیلان کە تا ئێستا کەوتۆتە بەردەستی هونەردۆستان و لەئەرشیفی گۆرانی کردیش ماوەتەوە، بەلام رەنگە هەندێ دەزگای راگەیاندن بەتایبەتیش رادیۆیەکان ئەرشیفەکەیان بێ بەش بێت لەبەهرەی ئەم هونەرمەندە نەمرەو لەبایەخی نەزانن.

١-چەند گۆرانییەکی لەئێزگەی بەغدا تۆمار کردبوو لەوانە (ئاوازی سکالا، گەلاوێژ، مەولەوی، راز ، فریشتە.

٢-لەساڵی ١٩٧٦ چەند گۆرانایەکی تر لەسەر (قەوان) ئیستیوانە تۆمار دەکات لەوانە (باران بارانە، جوانی بێ تاو... هەر لەم ساڵەش دەگەڕێتەوە سلێمانی کە ئەمە دواجاری بووە چاوی بەنیشتمانە بریندارەکەی بکەوێت تا کۆچی دوایشی.

٣-کاسێتێکی گۆرانی لەگەڵ گۆرانی بێژ رزگار رەنجەڕۆ کە ئەو کاتە رزگار ناوی لەخۆی ناوە گۆران لەگۆرانیەکانی ئەو کاسێتە (سەمفۆنیای هێمنی کوردی، لاوانەوە بۆ هەڵەبجەی شەهید، کەی تۆم دیوە، فریشتە، سەمفۆنیای فانتازی، راستەی خەیابان، قژکاڵی لێوئاڵی، ئەمڕۆژە رۆژی نەورۆزە، قاسپەقاسپی کەوان، ئەژدهاك، هەڵپەڕکێی مناڵ، کوردو باخ، سەمفۆنیا بۆ گیانی بێ کەس، دەمی راپەڕین ، بەری بەیانە) ئەمە هەندێکیان تەنیا کورتە مۆسیقایە کە دیلان خۆی داینــاوە جگە لەمەش گۆرانسیەکان لەماوەدا زۆر کورت و پڕ مانان.

٤-کۆنسێرتی رادیۆی (پەنجەرە) لەگەڵ هونەرمەند (خالید رەشید).

٥-لەهەمان کاتدا مۆسیقای بۆ فیلمێکی یۆنانیو فیلمێکی عەرەبی داناوە جگە لەوەی بۆماوەی زیاتر لە (٢٠) ساڵ مۆسیقای بۆ کارەکانی رادیۆی پراگ داناوە کە ئێستا هەموو لەئەرشیفی ئەم رادیۆیە دەست دەکەوێت.

بەداخەوە تەمەن بواری نەدا دیلانی نەمر بەردەوام بێت لەسەر کارە نایابەکانی چونکە یەکێ لەپرۆژەکانی کە زۆر گرنگ بوو نەیتوانی تەواوی بکات ئەویش (مارشێك) بوو کە هەر بەنیاز بوو لەگەڵ (رزگار رەنجەرۆ) کاری تیا بکات وەك کۆڕال ئەویش سرودێکی مامۆستای شیوعی و نیشتمان پەروەر (عەبدولواحید نوری) بوو.

دیلانی نەمر نزیکەی نیوسەدە کاری هونەری کردووە بۆ ئەم نەتەوەیەی بۆیە لەدوا ساتەکانی تەمەنی دا زۆر بەئلواتەوە دەبێت کە بگەڕێتەوە کوردستانو بەئازادانە تێر ئاوو هەوای کوردستان هەڵمژێ، بەلآم بەداخەوە ئەو هەموو هیواو ئاواتانەی دیلانی شۆڕشگێرو شیوعی نەهاتە دیو لەرێکەوتی ١٨ / ٣ / ١٩٩٩ لەئاوارەییو لەشاری پراگی پایتەختی (چیك) دڵە مەزنەکەی لەلێدان کەوتو لە ٢٤ / ٣ / ١٩٩٩ بەئامادەبوونی هونەردۆستانو هاوڕێیانی لەگۆڕستانی شاری (پراگ) تەرمی هونەرمەندێکی گەورەی بەئەزموونو شیوعی بەخاك سپێردرا.

هەر لەدیمانەیەکی من لەگەڵ رزگار رەنجەرۆ کە گەڕابۆوە شاری هەولێر لەساڵی ٢٠٠١ دەربارەی (قادر دیلان) دیمانەیەکم لەگەڵی سازدا ئەم دوو وەلآمە زۆر سەرنج راکێش بوو لەلای من کە هونەرمەند رزگار رەنجەرۆ بۆی باس کردم ئەویش قادر دیلان لەلای هەموو کەسێك زۆر بەشانازییەوە دەی وت: " لەساڵی ١٩٥١ پەیوەندیم بە حزبی شیوعی کردووەو تاکاتی کۆچی دوایشی لە ١٨ / ٣ / ١٩٩٩ هەر خۆی بەئەندامێکی حزبی شیوعی دەزانیو پێشکەوتوخوازێکی گەورەی کورد بووە".

ئەوی تریشیان کەئێستا بەدەنگو وێنە لەلای رزگار رەنجەرۆ ماوە قادر دیلان لەدوا ساتەکانی تەمەنی داوایەك لەهاوڕێکانی دەکاتو دەڵێت: "ئەگەر مردم تەرمەکەم ببەنەوە بۆ کوردستان تکاتان لێ دەکەم لاشەکەم ببەنەوە کوردستان، ئەگەر نەتان

توانی لاشەکەشم ببەنەوە ئەوا خۆڵەمێشەکەم ببەنەوە قەت لەچاکەتان دەرناچم ئێوەش هەر بژین".

لەکۆتایی ئەم نوسینەمدا بانگەشەی هەموو دەزگاکانی راگەیاندنی کوردستان دەکەم بەتایبەتیش کەناڵە ئاسمانیەکان هەر کەناڵێك ئامادەیە پەیکەرێك بۆ ئەم هونەرمەندە بکاتو لەشوێنێکی کوردستان دایبنێ من ئامادەم لەئەرشیفی خۆم (٦) شەش گۆرانی هونەرمەند قادر دیلانیان بدەمێ کە لەلای من پارێزراوە بەوێنەو دەنگەوە لەسەر کاسێتی ڤیدیۆ، ئەمەش مانای وانیە کە ئەمە لەبەرامبەر دروستکردنی پەیکەرەکە بدرێت بەو کەناڵە، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەیە رۆڵو کارەکانی ئەم داهێنەرە وون نەبێت لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەمە کە لەشوێنی ئەو گۆرانیبێژانەی بازرگانی بەهونەرەکەیانەوە دەکەن من مەبەستمە دیلانی نەمر بەدەنگ و کارەکەی خۆی لەشوێنی بازرگانی پێکردن تەنیا پەیکەرێکی بۆ بکرێتو لەساڵیادیدا پەردەی لەسەر هەڵماڵین.

تێبینی/ بۆ سوودبینین لەهەندێ رێکەوتی ساڵەکان سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

١- نوسینێکی خۆم لەسەر قادر دیلان لەچلەی ماتەمینی لەپاشکۆی (رێگا) ژمارە ٢٨ رێکەوتی ٥ / ٥ / ١٩٩٩ کە دەکاتە ژمارە (٦٥٠) ی رێگای کوردستان ساڵی (٥٥).

٢- دیمانەیەکی خۆم لەگەڵ گۆرانی بێژ رزگار رەنجەرۆ کە تایبەت بوو لەسەر قادر دیلان لەژمارە (٤٤٥)ی هەفتەنامەی رێگای کوردستان ١٩ / ٣ / ٢٠٠١ ساڵی (٥٦).

٣- نوسینێکی گۆران هەڵەبجەیی لەژمارە (٦٣٦) هەفتەنامەی رێگای کوردستان ٦ / ٤ / ٢٠٠٥ ساڵی (٥٩).